وا چۆن ئه که م ... ئه گه ر منی له شانۆ وازبینم .. ژیانم ئه بێته یه ک پـارچـه
به تالـی و بێ ئیـشی بـارێـکی ئـاواهـیش ژیـانی هـه ردوولامـان ئـه خـانـه
مه ترسی و راپیه وه . هه ر له به ر هۆیبانه ش بوو ووتم ده بێ له شانۆ ئاماده
بم بۆ ئه وه ی رۆڵه که ی خۆم ببینم . چ نکه ئه م ئه رکی سه رشان و پیشه مه ..
دوای بیبی رۆڵه که م بۆ ماڵ ئه گه رێنه وه و یانشین به به رپاره که م ئاگادار ئه که
و وله پاشی ئه وه پێکه وه .. به ره و ئه پارغانه که ی ئه که ونیه رێ بۆ ئه وه ی
ئه وئیواره یه به ببینی یه که ی شاد بێن مایکوفیسکی قایل به م رایه ی من نه
بووو له سه ر ئه وه ی خۆی بریاری له سه ر دابوو مایه وه ...ده وسیت کورتایی به
هه مو شتێ بێنێت خێراو یه کسه ر دوای ئه وه . ئه من ووتم ناتوانم به و شێوه
یه ی ئه و ده وسیت هه لسوکه وت بکه م پرسی لیم : باشه . تۆ ده ته وێ برۆی
بۆ شانۆ .. وا نی یه ؟
ووتم : به لێ ووتی : له ریش .. دیاره ده ته وێ یانشین ببینیت ووتم : ئه وه
م له خه یالدا هه یه ووتی وه ها ..؟ باشه برۆ .. هه رئێسته ئه بێ برۆیت ؟
ده ی برۆ ووتم : جارێ وه خته .. جونکه له ماوه ی بیست چرکه دا ئه توانم
بکه مه .. شوێنی خۆم . ووتی : نه خێر ئه بێ هه ر ئێسته برۆیت لیم پرسی
به لام ئه مرۆ ئه تبینم .. وا نی یه ؟ ووتی : نازانم ووتم : به لای که مه وه .
سه عات پێنج .. په یوه ندیم له گه لدا بکه ووت : وا .. ئه که م .. وا ئه که م
ئه وجا .. هه لسایه پێوه و ده ستی کرد به پیاسه کردن له نێو ژووره که .. ئه
وجا به راکردن . . چوو .. بولای نوسینگه که ی . گوێم له حنشه ی قاقه ز بوو
به لام هیچ شتێکم به پێش چاو نه ده که وت . به لام ئێسته له بۆم ده رکه وت
که وا په ره کان رۆژانی (١٣) و (١٤) نیسانی له رۆژمێره کی هه لدایه وه ..
ئینجا چه کمه جه ی نوسینگه که ی هێنایه ده ره وه وو فره ی دایه سه ر ئه رزه که
دوای ئه وه سه رله نوێ ده ست کرده پیاسه کردن له نێو ژووره که دا .. ووتم : به
رێم ناخه یت .. تا به ر ده رگاکه به لای که مه وه لیم نزیک بووه وه .. و ماچی
کردمه وه ده نگه که ی .. زۆر نه رم وخۆش بوو ووتی : کیژۆله که م .. ئه خێر
.. خۆت برۆ . خه می منت نه بێ ئینجا به زه رد خه نه یه که وه ووتی : –
پاشان په یوه ندیت له گه لدا ئه که م . ئه رێ .. باره ت پێ یه بۆ کرێ ی
ئوتومبیل ووتم : نه ا بیست رۆبلی دامێ دوای ئه وه پیم ووت : په یوه ندیم

له گه ڵدا ئه که یت وا یته ؟ ووتی یه : یه لیٚ یه لی به جیٚ ییم وچه ند هه نگاوێک .. چوومه پێشه وه به ره و . جاده که . هه ر له و کاته دا .. ده نگی گوله یه ک هێمنی و بیٚ وه نگی چرکه که ی شیتالٚ شیتالٚ کرد بومه له رزه ی هه له وسیته که ی ئاسمان و زه وه ی دایه ده م یه کدیه وه .. ده شم کرد به قیژه و هاوارکردن .. دام له دهگا که به لاٚم نه متوانی بیکه مه وه .. دیاره هه ولٚی گه وره م وسه ر ساموونیکیٚ گه وره تر دایگرتم پێش ئه وه ی بتوانی بچمه ژووره وه .. خولاسه ..چووم ... به لاٚم چیم بینی دوکه لی گولله که هه ر هێشتا له ناو ژووره که دا په نگی ده خوارده وه و مایکوفیسکی له سه ر به ره که راکیشابوو .. پارچه یه کی خوینی گچکه .. له سه ر سینگیدا هێلانه ی کردبوو .. بیرمه رامکرد بوته وه ی به ته نیشتیه وه زداپنیشم .. به قیژه و واوه یلیٚ ئه م لاوانده وه .. ووتم : چیت له خوت کرد . چیت خوت کرد ؟ چاوه کانی کرابوونه وه .. هه ناسه ی لیٚ برابوو .. چاوی له چاوم دوور نه ده خسته وه .. هه ولٚی ده دا سه ری به رزکاته وه به لاٚم نه یتوانی .. دیاربوو ده یویست شتیک به من بلٚیت به لاٚم خیٚرا رووناکی ژیان له چاوه کانی کوژایه وه دمم وچاوی و ملی .. زه رد هه لگراسانه وه .. له دواییدا لاریبووه وه . ئینی خه لٚکه که .. هاتنه ژووره وه .و یه یه کتر په یوه ندیان کرد .. به کیکیان ووتی : خیٚرا که ( ئوتومبیل ) ی ( اسعاف ) بانگک بکه .. رامکرد به بیٚ هوشی .. چووم ( اسعاف ) ه ک بینم .. ئه ویش خیٚرا هات ئه وجا به راکردن .. به سه ر قالٚدرمه که سه رکه وتم .. له سه ر رووی قالٚدرمه که یه کیٚ ووتی ( درنگک گه یشتیت .. مایکوفیسکی مرد ) ئه و سالاٚنه به خته وه رتزیهه و نا خوشتریهه سالاٚنی ته مه نم بوون .

# پەخشەرو ڕادیۆ و تەلەفزیۆن

## هاشم جەباری

لەبەر ئەوەی ماوەی بیست ویەک ساڵە لە تەلەفزیۆن دا پەخشەرم و خاوەن تاقیمانەیەکی باشم لەم بوارە داو لەم ڕێگەیەوە پەیوەندی یەکی بەرافراوانم لەگەڵ بینەران دا هەیەو بەردەوام بینەران لەهەر دەرفەتێک دا بۆ جۆرەها پرسیاری کاروبارو هەڵسی وکەوتی پەخشەر چوتێتی ئەنجام دانی دەنگ وباس و بەرنامەو دەیەها پرسیاری ترم لێ دەکەن بەڕادەیەک گەیشتمە ئەو بڕوایەی کە پێویستە وتارێک دەربارەی پەخشەر بنوسم ، هەرچەندە لەوانەیە هەندێ خوێنەری بەڕێز بڵێ ئێنجا ئەم مەسەلەیە بەئێمەچی ! ..
بەڵام من دەڵێم : نوسین لەم بارەیەوە ئەگەر سودی نەبێ زیانیشی نیە ، بەڵکو بەپێچەوانەوە جۆرە زانیاری یەک لەم بوارەی ئیش وکاری پەخشەردا کە لەبەر چاوو گوێ ی زۆربەی هەرە زۆری بینەران دایە بەدەست دەدا .
بەر لەباسکردنی پەخشەرو ڕۆڵی پەخشەر لە تەلەفزیۆن دا پێویستە پەنجە بۆ هەندێ قسەو بۆچون درێژ بکەین کە ناوە ناوە هاتونەتەرو ...
کەسێنەما داهات هەندێ کەس وتیان ئەم داهاتە هەتا بە شانۆ لەناو دەبات، کاتێکیش کەشریتی تۆمارکردنی دەنگ داهات وتیان ئەم داهاتە دەبێتە هۆی پشت گوێ خستنی ( قەوان ) ، هەمان قسەو بۆچونیش دەربارەی ڕادیۆ و داهاتنی بێ تەل و کارکردنیان لە ڕۆژنامەگەرێتی سەریان هەڵدا .
بەڵام ئەم هەمو بۆچون و بیرکردنەوانە ڕاست دەرنەچون ، چونکە ئەم هەمو داهاتانە بونە هۆیەکی گرنگی پەیوەندی کردن بەکۆمەڵانەوەو بونە پەیوەستی نیشان دانی داهێنانی هۆشی ئادەمیزاد لەبوارەکانی ئەدەب و زانست و هونەرو ڕۆشنبیری گشتی و ڕاگەیاندن دا ، لەمەش زیاتر هەندێکیان بونە پاڵپشتی ئەوی تر بۆنمونە : لە ئێسگەی ڕادیۆدا قەوان و شریتی دەنگ لە دەرهێنان و پێشکەش کردنی جۆرەها گۆرانی و مۆسیقا و دیدار و تۆمارکردنی ئاهەنگ و بۆنەکان دا بەکاردێن .
بەڵام بەنیسبەتی ڕۆژنامەگەرێتی ، ئەوە ئەمێش گەشەکردو

په ره ی سه ند و بوه سه رچاوه ی ده نگ وباس و لـی دوان و لیکـوڵـینه وه ی
ڕۆ ژنامه گه ریتی که ڕادیۆ له جۆره ها به رنامه و ده نگ و باس دا پشتی پی ده به
ستیٚ .. هه مان شتیش به نیسبه تی ڕادیۆوه ڕوی دا که به شیوه یه کی ناڕاسته وخۆ
بیری گویٚ گر به ره و ڕۆ ژنامه ڕاده کیشیٚ .. چونکه گویٚ گر که له ڕادیـۆوه گوی ی
له هه واڵیک ده بیٚ ، ئاره زو ده کات به شینه یی و له و شوینه ی خوی ده یه ویٚ
له ڕۆ ژنامه ش دا بیخوینیته و . ، به م جۆره ده بینین ڕادیۆ یاریده رێکه بۆ زیاتر
فرۆشتن و له چاپ دانی ڕۆ ژنامه .. بۆ به ڵگه ئه و ڕۆ ژه ی ڕوداویکی سـیاسـی
هه بیٚ ده بینین خه ڵکیکی زۆر هه وڵی کڕینی ڕۆ ژنامه ده ده ن ...

سـاڵ هات و ساڵ ڕۆیی ته له فزیۆن داهات ، هه نـدیٚ وتیـان بـه داهاتنـی
ته له فزیۆن ڕادیۆ به ره و نه مان ده چیٚ ، له مه ش دا به هه ڵه داچون چـونکه
ڕادیۆ پالیشتیکی گرنگی ته له فزیۆنه ، له به ر ئه و ه ی ته له فزیۆن به بیٚ ڕادیۆ
ته نیا وینه یه کی بیٚ ده نگه ..

لیره دا بۆمان ده رکه وت که شانۆ سـه ره رزو خاوه ن میژو و شکۆمه ند
مایه وه و زیاتریش به ره ی سه ندو پیشکه وت .. سینه ماش وه کو سه نعه ت و هو نه ر
کاری تیٚ نه کرا و ته له فزیۆن نه تیوانی له ناوی بدات چونکه سینه ماش وه کو شانۆ
به ردی بناغه ی ته لـه فزیـۆنه ، هه مان مه سـه لـه ش به رامبـه ر ڕادیـۆ کـه
ده سه لاتیکی کاریگه ری له بواره کانی ڕاگه یاندن و کیشه ی ئایدیۆلۆژی دا هه یه .

به کورتی : ته له فزیۆن ئاوێته ی سیٚ جوره هونه ری سه ره کی یه : ( شانۆ
.. سینه ما.. ڕادیۆ .. ) لیره دا ئه م پرسیاره سه رهه لده دا .. شوینی پـه خشـه ر
له ته له فزیۆن دا کویٚ یه ؟ ..

بونی په خشه ر له تـه له فزیۆن دا ، له ڕادیـۆ گرنگـتره ، چونکـه په خشه ر
له ته له فزیۆن دا ڕوی ڕاستـه وخۆی ده زگای تـه له فزیـۆنه و ده رچونی لـــه
ته له فزیۆن کار له ژیان و ره فتاری له شه قام و شوینه گشتی یه کان و نیو ئه و
که سانه ی به ده م وچاو باش ده یناسن ده کات .. ڕاسته په خشــه ری ڕادیــۆ
ئاراده یه کی باش له لایه ن گویٚ گرانه و . ده ناسریٚ ، به لام ته نیا به ده نگ نه ک
به ره نگ ، ئه مه ش به نیسبه تی په خشه ری ته له فزیۆن پیویستـی ی به زیاتر
ئاگاداری ی ره فتارو سه ربه ستی که سایه تی هه یه تاکو له به رده م خه ڵک دا
ڕێک وپیک تر بجولیته وه و به شیوه یه کی جوان و خوو ره وشتیکی بالآوه ره فتار
له گه ڵ خه ڵک دا بکات .

په خشه ر بۆ ئه وه ی بینه ران له ته له فزیۆن ، یان له شه قـــام و شـــوێنـــه کشتی یه کان دا ده یبینن به دڵیان بێ پیویسته ئـه م مه رجانـه ی تیـــدا بـــێ :( ده نگی باش ،ده م و چاری جوان ، خوێندنه وه ی باش ، رێزمان زانین ) ئه مانه هه مو په خشه ری سه رکه وتو پێک ده هێنن .

لێره دا پێویسته بڵێ ین ، ده نگی باش له خـــراوه یه و به هونـــه ری راهێنـــان و په روه رده کردن دروست نابێ . ده م وچاوی جوانیش هه ر له خواوه به هونه ری ئارایشت ناتوانێ ناشیرین جوان بکات .. به لاّم چۆنێتـــی خوێندنه وه و رێزملن زانین به راهێنان و خوێندنه وه و هه وڵدان ده سته به ر ده کرێ ، جگه له م مه رجانه ش ، رۆشنبیری ی گشتی بۆ په خشه ر زۆر پێویسته ، واته په خشه ر ده بێ رۆشنبیربـــێ نه ک خوێنده وار جیاوازی له نێوان رۆشنبیرو خوێنده وارش زۆره .. ئیستا پرسیارێکی تر سه رهه ڵده دا .. ئایا په خشه ری ته له فزیۆن ئه کته ره ؟

په خشه ر پێویسته شاره زاي له هونه ری نواندن هه بێ ، بـه لاّم هه رگـــیز ئه کته ر نیه .. چونکه گرنگترین بابه تی په خشه ر کـه لـــه تـــه له فزیـــون دا ده یخوێنیته و . ده نـــگ وباسه ، ده نگ وباسیش ده بێ په خشه ر به ده نگ و جوزی خوێنننه وه ده ری ببرێ ، به مه رجێک ده م و چاوی په خشه ر کاتی خوێندنه وه ی هه واڵه که بێ لایه ن بێ ، چونکه په خشه ر هۆیه کـه بـۆ گه یاندنی هــــه واڵه کان به بینه رو ئه کـــته ری کاری دراما نیـــه .

پێداویـــستی سه ره کی ی لـّه هـــه ر په خشه رێکی رادیوو ته له فزیۆ ن دا ئه وه یه په خشه ر که بۆ گوێ گرو بینه ر ده دوێ ساده و راست گوبێ ، په خشه ری لێ هاتوش ئه وه یه بتوانێ ده سه لاّت به سه ر (ده ق )دا بگرێ .... مه به ستـــیش له ده سه لاّت گرتن به سه ر (ده ئنجاق ) دا ئه وه یه له سه ره تادا باش له ده قه که بگات ، ئینبی پێشکه شی گوێ گرو بینه ری بکات .

گرنگترین خاڵ به نیسبه تی په خشه ری رادیۆ ئه وه یه ده قه که به جۆرێک بخوێنیته وه که گوێ گر وابزانێ راسته وخۆ قسه ی له گه ل ده کاو له سه ر کاغه ز نایخوێنیته وه. لێره دا ئه م خاڵه له به رده م کامیراو له ته له فزیون دا زۆر پێویست تره چونکه په خشه ر خۆی له به رچاوانه و ناتوانێ کاغه زه کانی بشارێته وه و هه رچه نده هه ندێ ده ر هێنه ریش ئاره زوی شاردنه وه ی کاغه زو مێکروفۆن ده که ن ، به لاّم به رای هه ندێ ده رهێنه ری تر واباشتره کاغه زو مێکروفۆن دیاربن ،چونکه نابێ ئه و راستی یه بشارنه وه که په خشه ر وێنه یه کی زیان ده ر نابرێ به لکو وتارێک یان

ده نگ وباسیک پیشکه ... کات ئه بینه ران پیشتر ده زانن ئاماده کراوه و له سه ر کاغه ز نوسراوه ته وه .

په خشه ر بو ئه وه ی بتوانی ئه و بابه ته ی ده یخوینیته و له بینه رو گوی گری بگه یه نی پیویسته زور باش له بیرو بوچونی نوسه ری ده قه که بگات و باش وشه کانی ده قه که تیبگات ، چونکه به م تی گه یشتنه ده ترانی وشه کان ده ربری .. خالیکیتریش به نیسبه تی په خشه ر گرنگه ئه ویش ئه وه یه په خشه ر پرسیار له خوی بکاویلی .. من بوکی ده دوێم ؟ . لیره دا ده توانی له بیرو میشکی خوی دا وینه ی فراوانترین و گه وره ترین که رتی کومه لان بکیشی و بوخوی دوپات بکاته وه که بو کومه لانیکی فراوانی بینه رو گوی گر ده دوی ..

به کورتی ، ئه مه بو ئه رکی سه رشانی په خشه ر، ئینجا ئه گه ر په خشه ره که کوردبی ، یان عاره ب ، یان بیانی . به لام به نیسبه تی په خشه رانی رادیو و ته له فزیونی له مه رخومانه وه که ئائیستا ده یه ها ره خنه و ناره زاییان به رامبه ر نوسراو ه و وتراوه ، ده لیم : من له گه ل زور به ی ئه و ره خنانه م، راسته هه ندی په خشه رمان هه یه ته نانه ت من خوم که قال بوی ئه م بواره م له وه رگیران و خویندنوه یان ناگه م ، به لام بو ؟ .. له ولاتان دا په خشه ر ته نیا خویندنه وه ی بابه ته که ی له ئه ستودایه به بی ئه وه ی ئاگای له وه رگیران و ئاماکردنی هه بی ، به لای که مری ده بی ماوه ی شه ش مانگ له ژیر تاقی کردنه وه دابی و به شداری ی له و خولانه دا بکات که بو پی گه یاندنی په خشه رو پیشکه ش که ری به رنامه سازده کرین ، که چی له رادیوو ته له فزیونی کوردی دا ده بی په خشه ر خوی ئه و بابه ته ی ده یخوینیته وه وه ری بگیرێته کوردی ، جاری واهه یه پینج ده قه ماوه بابه ته که پیشکه ش بکات که چی هیشتا وه ری نه گیراوه ، بی گومان له م حاله ته ش دا وه رگیرانه که ی کرج وکال ده بی و له وانه یه خوشی نه زانی چ ده لی من لیره دا پشت گیری ئه و په خشه رانه نا که م که ئه مه یه توانایان و له ناخی دله وه حه زم ده کرد په خشه رو وه رگیری به هره دارو شاره زامان هه بوایه به لام ده ستی نه بونی بشکی ..

لیره دا به و که سانه ی که ته نیا ئامانجیان توانج تی گرتن و له نرخ داگرتنی په خشه رو به رنامه کانی رادیوو ته له فزیونی کوردی یه (له گه ل لاوازی ی هه ندیکیشیان ) ، ده لیم : ئائیستا چه ندیکیان به ده نگمانه وه هاتون و له م باره یه وه ده ستی یارمه تی یان بو دریژکردوین ؟ ... ئه وانه ی که خویان بو ماوه یه ک

له بواری رادیوو ته له فزیون دا کاریان کردوه و به رنامه یان پێشکه ش کروه ، ئه گه ر ته نیا مه به ستیان خزمه ت کردنه ، بۆ وازیان هێناو به رنامه کانیان چه نێ سه رکه وتوبوو زمانیان چه نێ پاراوبو ؟ خۆ بینه ر هێشتا زۆر به ی ئه و به رنامانه ی له یاده و دیته وه به رچاو !! ده یه ها جار تاگانامه ی وه رگرتنی کچه په خشه ر له ته له فزیونی کوردی بلاوکراوه ته وه ، به لام چه ند که س له و به رێزانه ی ره خنه و توانج له کچه په خشه ره کان ده گرن (که به رای من له گه ڵ - هه ندێ لاوازیشیان - له بواری کاره که یان دا ، زۆر پیرۆزن و جێگه ی رێزوستایشن ) ، ده ڵێم ! چه نێک له و به رێزانه خوشک وکچ و ژنی خۆیان بۆ کارکردن له م مه یدانه پیرۆزه دا ناردوه ؟!

بۆ ئه وه ی زیاتر له وتاره که م ده رنه چم ده گه ڕێمه وه ده ڵێم : ده بێ په خشه ر ده ربری هه ست ونه ستی گوێ گرو بینه ربێ به لام به خووره وشتی بالأو ره فتاری دڵسۆزانه و خۆشویستنی هه موان و رێزلێنانی گه وره و بچوک و ژن و پیاو تاکو بینه ر زیاتر له ته له فزیون نزیک ببێته وه و ئه دیب و نوسه ران و خاوه ن به هره و شاره زا هێژاکانیش رومان لێ بکه ن و ده ستمان بگرن بۆ پێشخستن و په ره پێدانی توانای په خشه رانمان و گه شه کردن و پێشکه وتنی به رنامه کانمان .

تێبینی : ۱- له م وتاره دا تاراده یه ک سودم له وتارێکی به رێز (حافظ القباني ) له په خشنامه یه کی ئاموزگه ی راهێنانی ته له فزیونی دا وه رگرت .

۲-په خشه ر : مذيع

# سروودی خه ج و سیامه ند

محمه د به دری

هۆ ، هۆ خه جێ
شه و ده ڕنگه و رێ هه ڵدێره و
منیش ئاوا چاوت لێمه
جوڵانه مه ، دێم و ئه چم
برۆ خه جێ
خۆ ده ربازکه
خۆ رزگار که
ئیتر به سه چاوه ڕوانی
تۆ نازانی ؟ !
چاوه ڕوانی
باڵنده یه کی ئاواره و به ره لایه
زوڕنایه که
به درێژایی ئه م ژیانه جه نجاڵه دا
ئه قیژێنێ و ده نگی نایی
چاوه ڕوانی
گه ماڵێکی درنده یه

ده عبایه کی بیْ ها وتایه .
چاوه ڕوانی
ئه رزێکی وشک و تینووه و
هه رچی دادو فرِیا ئه کا
باران نایێ ؟!
چاوه ڕ وانی
گوْ مێکی لێلْ هه لْگه ڕاوه
چاوه ڕوانی
گه رده لوولە ، ره شابه یه ؟ !

*　*　*

هوْ ، هوْ ، خه جیْ
شه و دره نگه و ره شمالْی خه م
به سه ر خه رمانی ئاواتدا هه لْدراوه
رووبار ئه ڕواو
که ژاوه ی خواست و ئاره زوو
له و بیابانه تاره دا
ون کراوه ...
منیش خه جیْ
له نیوانی ئه م ئه رزو ئه م ئاسمانه دا
هه لْوْ یه کی بالْ شکاوم
ئه م دره خته ش

که خۆم پیا هه ڵواسیوه
جارێ ئه بێته سێداره و
به ره و نه مان ڕاوم ئه نێ
جارێکیش تیشکی ئاواته
مژده ی مانه وه و نه جاته .
پێئه که نێ
ئه ڵێ
خه جێ چاوه ڕێ یه
گیانه خه جێ
ئا ئه وه تا ، ته ماشای که
ببینه چۆن پێئه که نێ
ببینه چۆن پێئه که نێ
*　*　*

هۆ ، هۆ ، خه جێ
شه و دره نگه و خۆت ئه زانی و
ئاگاداری
که نه ریتی کورده واری
وه ک به رده که ی ئه ڵحه د وایه
که نه ریتی کورده واری
ماروو دوپشک و ده عبایه
که نه ریتی کورده واری

ته لیسمێکه

مه گه ر خوا خۆی پیێ بزانێ
کلیله که ی له کوێ دایه
تۆ خوا خه جێ
به سه ئیتر چاوه ڕوانی
تا به یه کیش ئه گه ینه وه
خوات له گه ڵ بێ
هه رچه ند حه زیشم له وه بوو
خۆم له گه ڵتا به ره و مه نزه ڵ
بچوومایا ..
به لاّم چبکه م
که رووبار مانی گرتووه و
باڵنده ی به خت ی ده روونم
هاوار ئه کا
حه زم ئه کرد بچوومایا
حه زم ئه کرد بچوومایا
* * *

هۆ سیامه ندی له نیوان
مان و نه ماندا سه رگه ردان
هۆ به فره پاک و خاوێن و
بێگه رده که ی لووتکه ی ژیان

هۆ جوانه مه رگی نه مرو
کانگای سوزو به وه فایی
هۆ گیرۆده ی داوی
ئازارو ته نیا یی
دڵنیابه
ئه وه تا کاروانی شه فه ق
ملی به هه ورازدا ئه نیٚ
باڵنده ی به خت و هیواشمان
وازی له گریان هیٚناوه
وه ک به فره که ی کوێستان وایه
وا خه ریکه پیٚئه که نیٚ
هه وراز کرنووشی بۆ ئه باو
لووتکه ی ژینیش
مۆری شادی پیٚوه ئه نیٚ
مۆری شادی پیٚوه ئه نیٚ

# دارعه رعه ری زیندوو

## له تیف هه لْمه ت

دار عه رعه رێک ... له به ر  مالْمان
یاری  ده کرد .. له گه لْ  بالْدارو  مندالاْن
شه ویْ ... نه یاریْ  ره نگک  گوْگرد
ته ورێکی  له گه لْ  خوْی  هاورد
دارعه رعه ره که ی  په ل په ل  کرد
کردی  به  پشکوْی  ئاگردان  ... !

***

منالاْنی  گه ڕه ک  هه موو  کوْبوونه وه و
گشت  زه وی یان
داپوْ شی  به  لقی  گریان ...
ره گی  دارعه رعه ری  برِاو
هاته  زمان :
ئه ی  منالاْن
له جیْ ی  فرمێسکی  داخ وژان
ئه گه ر  خوێنی  ئه و  نه یاره

برژێننه بن ریشالّم
چه که ره ده که م دووباره
گه لاٚ ده گرێ په ' وپوێ نوێ ی
خه نده ی ئالّم ...

***

له وروژّه وه منالّه کان ... هه رچی شاره
چی بن به رود چی پالّ شه خه لّ و داره
چی ئه شکه وت و ... چی کوێساره
چیٚ پیێوارو کوێپ و که لاوه و ته لاره
ده گه رێن بوٚ ئه و نه یاره
تاخوێنه که ی برژێننه بن ئه و داره ... !

# * من له هه لۆ عاشقترم *

* مه هاباد قه ره داغی *

کێلـگه ی زامم
خه رمانی گه وره ی چه قۆیه
گۆمی خوێنم
شێوه ی نه رژه نگی
سورترین تابلۆیه
سه ریشم پایته ختی برۆای پڕ شکۆیه
کفن ئالای شه کاوه ی
سه ر کارگه ی گیانی نه به زینمه
له خوێن ده ست نوێژێ هه لگرتن
هه توانی گه وره ی برینمه

***

مه هاباد قه ره داغی
١٩٨٩/٤/٢٩
کفري

# ئه م خونچانه ش

* شیعری مه سعود
په ڕیشان

- ١ -

## * ده روازه «١» *

له ڕاژه نینی مژده ی پشت
ساباتی حه وته می ئاسمان
هه رچی دێوه زمه و نه هه نگی ڕوو زه رد هه یه
جووتێ باڵی مێروو لانه ی لێ ده ڕسکێ
ته نانه ت گه سک به ده ست و
جام له پێش و
نان له سه ریش

-٢ -

## * دارستان *

گیاندارانی ناو ئه م دارستانه چڕه
هه میشه یه کتری ده خۆن

دارستان و

ئاژه لَه کانیش پێویستیان

به خه وێکی زۆر قوولْ هه یه

- پایز هێشتا گه لێ دووره

- به هار دوورتر .

-٣-

## * ڕۆژ گیران *

دوای ده ف وه ستان

ده مبینی له ناو قه رسیلێ

یارپرِه وی

پێش مزگه وته که ی کاوله دێ

(١) ده روازه /مه به ست له ناوی ئه و ده رگایه ی (ئیمامی کازمه) له به غدا . که ئافره تان له وێوه

ده چنه ژووریْ و پێ ی ده کوترێ - باب الدروازه -

# چرای هۆنراوه[٧]

کورته شیعر

**شیعری : حه مه ی احمد رسول .**

## باران

له جه سته ی تۆوه ، باران ئه بارێ
بۆنی گولاوی کازیوه ی عه شق ، له گه ڵ خۆی دێنێ
دڵۆپه ی باران ،
له جیاتی گه لاٚ .. دڕکی حه سره ت و
نائومێدی و خه م وا ئه وه ر ێنێ ...!

## ماچی پاک

هه رچه ن ڕۆژگار بێتو بڕوات
هه رچه ن ساڵی چه رخ وه رسووڕێ
ساڵ له دوای .. ساڵ
مۆمێکی دی له ڕووناکی ته مه نم بکوژێنێته وه
هه رچه ن ئه مرۆ دوێنێم له بیر به رێته وه

چۆن ئه توانێ ... شڵپه ی ماچی
کیژه شێته که ی دراوسێمانم ، له سه ر گۆنا بسڕێته وه !

## سبه ینێ

چ مه خسه ره یه ک
به سه ر ڕووخساری جیهانا دادێ !؟
یان چی ڕوو ئه دا ...
له بری ئه وه ی له سنگی مندا
دڕکی ئازارێ هه ناسه م ببڕێ
باله دڵمدا ، داری (گوڵ ) بڕوێ !

## تریفه

له قووڵایی شه وه زه نگا ، هانا ئه به م
بۆ تریفه ی ئه ستێره یێ ..
زۆر له دوور ئه گا به دیده م
په ل بۆ چله پووشێ ئه به م !
له گه ڵ چاوی بێ تخووبی
زمانه دا ... سه ما ئه کا
له گه ڵ تریفه ی به هاری ژانی منا
هاوزار ئه کا ...!!

## چرای هۆنراوه

هه وری ئاسمانێ ، نووستووه

دووکه ڵێ له ئاگر تۆراوه
کۆتری ژین ، کۆست که وتووه
دار چناریێ .. له خۆوه ڕا به لایا دێ
چرای شیعریێ ، کز ئه سووتیێ !

## چاوی تۆ .. دڵی من

چاوی تۆ
پڕ ترس و حه سره ته
وه ک چاوی باڵنده ی تاساوی
نێو چنگی مناڵێ ..
- ڕه گی ئه و ئازاره ت .. ئه ی کوانێ ؟!
دڵی من
هاژه ی دێ ، هه میشه ئه ناڵێ
ئه ی کێ بێ شه پۆلی سۆزی ئه و ده ریایه ، ڕاماڵێ
-ده نگی ئه و ته وژمی ده روونه .. ئه ی کوانێ ؟!
<< چاوی تۆ .. دڵی من ، نه ڕه نگه و .. نه ده نگه
کێ ئه ڵێ هه میشه ده روونم .. ده روونت ئه ناڵێ !!؟

## نـه مــری ی

گوڵیش هه ر پیر ئه بێ و .. ئه مرێ
به لاَم له سه ر له پی ده سته کانما
پێش مردنیان .. بۆنیان جێ ده مێنێ !!

## گــریان

گوێم له گریانی منالێکی ته زیوه
زاری لاواننه وه ،
گۆ ناکاو .. خوێنی شیعر مه ییوه !

## دووباره بوونه وه

چاوه ڕوانیت ، ..
ئه ستێره ی ته مه ن ، ئه ژمێریت

پێکێ .. دووپێکت خوارده وه
شه و په رژێنه ، هه ر بێداریت
جگه ره یێ .. دووهه مینی کوژانده وه !

## بــۆ ئایــیـــنـده

ئه ی شه مالْ ، به ره و کوێ
ته وێلی کام شاخ و
ئاسمانی کام وولاْت ته ی ده که ی
ئه ی سروه ی سۆزی من
ده روونی تۆ هه رده م .. هاوه ڵی سه فه ره
له مه و پاش با بۆ من هاوده م بی
سبه ینان که هاتی ، له گه ڵ خۆت سه رپۆشی
هه تاوی خنکاوی ئه م عه شقه خامۆشه م ، لابه ره !

## چاوی شیرین

دەمەو عەسرانەو بەفر ئەباری
لە ناکاودا .. چاو هەنگوینی تیپەڕ ئەبێ
کەچی سەیرە ! لە دەرەوەو لە سەرمانا هەڵئەلەرز
لە ناخەوەش وا ئەسووتێم

## بەڵێ و ... نە خێر

دیومە گەلێ جار
ڕۆڵە لە حەژمەت مەرگی دایکا
بیابان و دەشتی نێو هەوران تەی کا
بەڵێ من دیومە
دڵۆپێ شەونم ، . قەترەیێ ڕوندک
کڵپەی سووتانی سەراپا شارێ بکوژێنیتەوە
نەمدی سێبەری مانگی نێو سەراب ،
بدرەوشێتەوە ..!
<< دیومە گێژەن ، سەری ڕووتی بنارێکی
لە مێخەوە هەڵگرتووە
دیومە ئاگر ، وەک ئەهریمەن
بە نێو شادەماری درەختا ڕۆچووە
نە من .. نە تۆ ، نە ماندیووە
ماری برسی ، پاسەوانی ڕێبوارێکی نووستووی ژێر دارێ بێ
تۆش وەکو من کە نەتدیووە ... بۆ ناپرسی ؟! >>

## په رجووی * دڵ

چ سیحرێکه !
به و پاییزه ئاشنای تۆم و حه زم لێته
یا وه رزی سروشت بیٚ مه یله
یا دڵی منه و بیٚ واده ، وا سه رشێته !

## ترسی بێهووده

چونکیٚ ئه ترسیت ،
جیهانی ڕوٚشن دارستانێکه وه ک قه ترانی شه و
هه ر له به ر ئه وه ی چیدی نه ترسیت
چه ند ساڵی ڕه به ق ، چاوت نه چووه خه و !
– هه ر له ترسایه
خه می بێهووده ، بوٚته قه فه زیٚ
تیایا باڵنده .. ده نگی ده رنایه ..!

---

۱۹۸۸-۱۹۸٦

* په رجوو : مـــوعجـــیـــزه ، موجـــیزه .

# ڕه وانه ویڵه که ی ئه بونه واس

## هۆنراوه‌ی

عوسمان محه مه د هه ورامی

زۆر مه ست و کاس
ڕه وانه زۆر شێتۆ که که ی ئه بو نه واس
وریا ڕه وان ،
دار شه قێکی شه ق و گران
یاریده ی هه نگاوی ئه دا ،
مێز به مێز که وتبووه گه ڕان
به ناو هه موو باڕه کانی سه ر دیجله دا
گه شتی ئه کرد ،
بانگی مه ستیی خۆی هه ڵ ئه دا
پێڕ به پێڕی ئه قوسته وه
هه موو پێکێکی دێرینه ی

پیری موغانی لسته وه
له گزنگی
هه تاوی هێمن و نه رما
له به ر تینی
تیشکی نه سارد و نه گه رما
ناخی هه ناو گڕی ئه گرت
کلپه ی شیعری به رپا ئه کرد ...
پیری بێ په ی
تێکه ڵ قرچه و ناڵه و نرکه ی
مرواریی ڕوونی هه ڵ ئه ڕشت ،
ورد و درشت
هه مووان که وتنه گێژی زریان ،
پێشبڕکێ بوو بۆ شیعری جوان ، ...
به رانیه ریی دێوانه یان پێ نه کرا
به جارێ ده میان داپچڕا ....
له ئه نجاما
هه ناسه ی هه ڵبه ستیان نه ما ، ...
که گه یشته په یکه ره که ی پیری موغان
که وته گریان ، .....
له دوای هه ڵوێست و هاوارێ

لە چەند قوناخێکا جارێ
هەر کە ئە بزووت
سەر پە نجەی شیعری هەڵئە نووت ؛
لە پڕ جنوکەی شیعرەکانی
ئەکە وتە وە
ناو هە ناو و هە ست و گیانی ،
دیسا نە وە شیعری ژیان
وێنەی وە شتی گە شی نیسان
نە رم و نیان ،
وە کو ئاوازی بە هاری
ڕە وان ڕە وان دائە باری ؛ ...
بێ لان ، بێ زە وی ، بێ ئاسمان
دوور لە سامان ،
زۆر هە ژار و زۆر لات و لووت
ڕە ش و ڕووت وە ک سە لکە بزووت
پێخاوس ، تا بلێی پە ڕپووت ،
دا هێزراو و ، چلکن ، پە شێو
شێواو ، کولکن
هە ر وە کو دێو ،
سە ر و ڕیش و سە کوت ژاکاو

لە جیهانی بوون دابڕاو ؛ ...
لە بارەگای خوای هەڵبەستا
لە نزرگەی تایبەتیی شێت و مەستا
هەر ئەی نرکان ،
هەر ئەی نرکان
ناڵەی ئەگەیشتە کەشکەلان ؛ ...
دەنگی بە دڵی هەڵ چنیبوو
ورد ورد هەناوی جنیبوو ،
وەکو بورکان ، هەڕ لە پڕ دا
شیعری گڕ هەر قوڵپی ئەدا ... ؛ ...
لەگەڵ سۆزی دڵ تەزێن و کاریگەردا
گوڵ بارانە
بەسەر کۆڕ و دەور و بەردا ،
دابی ئەم کۆڕە شمان وایە
هەرچی ڕێبواری شەیدایە
چەپکە گوڵێکی هۆنراوەی
هەمە ڕەنگ و زۆر ڕازاوەی
دڵ و هەناوی دێوانەی
ڕۆژگاری وێڵ
بۆ یادگاری کەشکەلان گێڵ ،

بۆ بە ربە ستی
مێردە زمە ی دە رد و پە ستی ...
ئە بێ بکا بە بە روکا
لە بارە گای شیعری جوانا
کڕنووش بە رێ و بێ بە چوکا ،
دوای گیر بوونی دوا تکا
جا ئە توانێ
بە دڵ ژوانی گیانی بکا ،
بێ پە روا ڕێ بگرێتە بە ر
بۆ سە رچاوە ی گە شی هونە ر

بەغداد : ٩ - ٢ - ١٩٨٤

# دوو دلی و
# دوو بڕیار و
# دوو ڕێ

(محسن ئاواره

ئه ژنوکانی ,که وتنه له رزین
له به ر چاویا , وێک هاتنه وه
بازنه ی ئاسمان , زه وی به رین

پاش ئه لوه ستێ

– ئه وه ی نه مده ویست وا روویدا
کزه بای سارد ، وه ک ده مه مووس
ڕوخساری جارانی تێکدا
ڕووی وه رسوڕاند
ته ماشای دواوه ی خۆی کرد
نیوه ڕێ ی پتر بڕیبوو

ئه مجاره یان ، ڕووه و بلندایی ڕاما
چاوانی وه ک ، قه تاره ی بزنه کێویلان
به هه ورازی ڕکک هه لگه ڕان

به فر دای کدر ، کلۆ کلۆ
ده هاتنه خوار ، تیسکه په مۆ

(با)ی سارد ، سه مای پێ ده کردن
کۆشی خاکیش ، دای ده کردن

هه موو گیانی ، قوڕس داهات
قاچه کانی ، له دوای نه هات
نه به ره و خوار ، نه هه وراز بڕ
له گه ڵ هه ست و خودی خۆیدا
که وتنه مشت و مڕ

- به ڕێ ی خۆمدا نشینو بمه وه
یان به و به رزایی یه هه لگه ڕێم .. ؟
له نێوانی ، دوو بڕیار و ، دوو سه ره ڕێم

به ره و هه وراز
ماوه ی که مه ، قوناغ کورته
به لام سه خته ، ڕێ ی دوو به خته

به ره و خواریش ، سه ره و لێژه
تا ده روێ نه ورایی و نشێو
وه لێ ڕێگاکه ی درێژه
ماوه .. ڕێگا
ڕێگا .. ماوه
بگه ڕێمه وه .. سه رکه وم
سه رکه وم .. بگه ڕێمه وه

دوو دڵی قاچه کانی له زه وی گیر کرد
سه رو دڵی دێنا و ده برد
برِیارێکی ده ر نه ده کرد

هه ر لێکدانه وه ی بێ ئه نجام
نه خشه ی زوٚری به ته نافی مێشکی وه کرد

به فر ده بارێ و ده بارێ
به فر خێراتر له جاران ، دێته خوارێ

سه رو پۆته لاک سپی بوون
هه ر نه یده ویست ، دایوه شێنیٚ
به فر ڕێگاکانی وون کرد
وا خه ریکه ده یبه زێنیٚ

له جیٚ ی خۆیدا
سه رکه وم ... بگه ڕێمه وه
بگه ڕێمه وه ... سه رکه وم

به فر تا ئه ژنۆکانی هات
به ڕاڕایی و ڵی قه وماوی
به لای ڕاست و چه پ داده هات

ته ونی خه یاڵی وڕوژاو
وه ک که شتیه کی ناو گێژاو

به ره و کام لای ده برده وه
به فر ڕه شی ده کرده وه
خۆی و دوو بڕ یارو دوو ڕێ
بوونه په یکه ڕێکی به سته ڵه ک له یه ک جیٚ !!

من هەست دەکەم
دڵم درووست کراوە
بۆ
خۆشەویستی گشت ئەم
جیهانە .. !!

*مۆلیر *

لە یاداشتەکانی ( ئاسیم بەختیار ) ١٩٧٢

*عباس عسکر *

- ١ -

پــــرد

---

ده نگێک له دووره وه دێت ، ئه گه رێته وه
روومه تت وشکه .. بیابانه .
دارودرخته .. !!
چاوه کانت ، وڕینه ی پێ پێوه نانه
ئه ستێره ی کاروانی غه ریبانه
به ده ردی ئه ڤینێکی تاسه
شه که ت کروان . !!
په نجه کانت ، پڕن له چزه .
پڕن له ته وزه . !
هه ر دوو لێوت ، پڕن له بزه
پڕن له قسه . !!
زه نگوڵه ی خه م به ملته وه کێ کردی
به ملوانک.

پێم بڵێ ، ئه شێ هه زار ساڵ بێ چاوه روانم
سه یری کردم
سه یرم کرد .
ئه ڵوه ن ووتی ، هه زار ساڵه تۆم نه دیوه
ماچی کێویم له روومه تت نه چنیوه . !!
زامه کانت گوڵاڵه ی هه وری بیابانه

نزیک ببه وه ... باسم بۆ بکه
ووتم ئه لۆه ن ، هێشتا ماوه.
قسه ی دڵم ئه فسانه یه نه درکاوه
په روباڵی ... نه سووتاوه
نهێنیه کانی ... نه وتراوه
به لاٛم چیبکه م ، هه ستی دڵیان
کردم به به رد
کردم به چه رم

*

گشتیان وتیان ، ئه م دڵداره
ئه بێت به گوڵستان .
پڕ له نێرگز ... پڕ لاڵه له م شار به وشار ،
له م دێ به ودێ ، بلاٛو ده کات بۆنی خونچه
پێشکه ش ده بێت ، به شاخ و مه ل
زه وی و تاژه ل
.. دڵ زاران

*

دیان وتیان
خه می ئه م دڵ قرچاوه ، قه دکه نه وه
باڵ و په ڕی ، بده ن به ده م نه هاته وه .. !!
تاکو ڕووبار ، سه یری نه کات

هه‌ستی تازه
ڕێ باز نه‌بێ بۆ شه‌وقی .

*

چۆن نه‌مزانی ، ئه‌م شانۆیه
په‌رده‌کانی ... وشه‌کانی
ژنه چاو چلکنه‌کانی له تاریکیدا
تابلۆیه‌کی ره‌ش بۆمیان
سازان .
* وه‌رزێکی تر *

---

١٩٧٣

خۆی ده‌زانێ
رمه‌ی عشقی ، له ده‌نگی دانه‌وه‌ی
ره‌هێله‌ی سامالْدا
چ هۆنراوه‌ک ، ده‌گێرێته‌وه
له پرشنگی ، خه‌ونه‌کانی ، ده‌گه‌رێت ..!!
بۆ سه‌مایه‌کی گرنالْ و دلْ ته‌زێن
تۆ بلێی ، به‌ر له مردنی دا
هه‌ناسه‌ی سروودی ، دوتێکی ده‌شته‌کی
وه‌ک .. بارێزه‌یه‌کی هێمن

په خش ببێت .؟!
له سه ر کۆتایی پردی ته مه نی دا .!!
کێ ده ڵێ
ئه م عاشقه ، گره وی کانگای دڵی
میراتی دڵدارانه .. ؟!
کێ ده ڵێ
رووخساری ، ئه م مرۆڤه
له تلیشی ئه م تابڵۆیه دا
هه میشه ، هه نگاوه کانی گیرۆده ی
ناوی کۆشی ، سه ر ده فته ری کوڵه واره کاندا
ئه مه ماوه یه که
به ده م جڵه وکێشانی ئاواره یی
بێ په نایه
بێ هه نگاوه .

# خۆزگە[٧]

ژیر

گەر بەختەوەری بە جوانی بوایە
کێ لەم دنیایە
ئەنیشتەوە سەر
ترۆپکی هونەر
وەکو ئێوەی جوان
ئەی خەفەتباری پەنا بۆ گریان ! ؟

خۆزگە بێتە لێ
یا گەرووی مەلێ
ڕازی دەروونی منی ئەگەیان
بە کوورە جۆشی دڵی شکاوت
خۆزگە هەناسەی
برژاوی تاسەی

گه یشتن به ڕووت ، ئه گه یبه دامان
برژانگی ته ڕی فرمێسکی چاوت

*　　*　　*

خوگه پیته کان
ئه بوونه وێنه ی په لکه زێڕینه
خویان ئه نوان
له دوای بارانی شه ستی دیره که ت
به ئاسمانه وه تیتیان ئه گه یان :
له بوته ی دلی منا ئه سووتیٚ
[illegible] ه وه ریی توٚ
تاویٚ کلپه یه ، تاوی پشکویه
تاویٚ ژیله موٚ

*　　*　　*

خوزگه چریکه م سه رتاپاسه ری
دنیای ئه هه ژان
هه رچی گیاندارو چی بیگیان هه یه
ئه هاته له رین
تاکو له دنیای ئاوازی خوشی و
به سته ی ئاهه نگ دا
توشی ئه بزوان ، توشی ئه خسته

سه ماوِ هه لْپه ڕین

*　　*　　*

خوزگه بوْ شانه ی قژی بیْ شانه ی
ئالْوزی شیْواو ، چنگی هوْشی منَ
وه کو ته لیسمیْ ئه گه ییه سه رت
خوزگه بوْ نه خش و بوْ ڕازانه وه ی
ئاردامانی ڕهشی ، ده ستی هونه رم
ئه نایه تالْی پوْشاکی به رت

*　　*　　*

خوزکه ئه بوومه
یه که م نویْنه ری شانوْی پیْکه نین
بزه م ئه نایه
سه ر لیْوی گه شی ناسکی شیرین

*　　*　　*

خوْزکه هه موو که س به بیْ دابڕان
وه کو دیْوانه ، یا وه ک شه م بوایه
له جیْگه ی ژاری خه م و په ژاره
هه میشه باده ی ماچی ده م بوایه

*　　*　　*

خوزیگه ئازیزم
وه کو په روانه دوو بالْم ئه بوو

به بی سره دت و وچان و ئارام
ئه سوورامه وه
به ده وری چرای گه شی شێوه تا
تا کۆتایی ژین ، هه ته ئه سووتام

* * *

خۆزگه چي ئیسکی له شی من هه یه
ئه یانکرده دار بۆ تابووته که ت
هه ر به و دار ه وه له ژێری گلا
پێکه وه هه تا ڕۆی قیامه ت

* * *

خۆزگه له جیاتی گل گۆشتی جه سته م
ئه کرایه خۆڵ و ئه نرایه سه رت
خۆزگه بۆ خه ونی زیندوو بوونه وه
ئه بوومه مۆمی ڕێگه و ڕابه رت

* * *

خۆزگه ئازیزم
هه ر له ئێستاوه ، وه ک وه کاله تێ ،
بۆ ڕێنمایی و زیان دانه وه ی
دڵی شکاوت ، به ره و نووسینگه ی
ئامێری هه ستم ، گورو زاتێگت

ئه نایه  به رت
به ڵکو  بۆ  ڕۆی
لێپرسینه وهی  دادگای  یه زادن
به رامبه ر  چه ر خ و  کاری  ناکرده ی
جیهانی  کێشه و  زۆرو  سته م و
پێیچه وانه ی  کار  ،  منیان  دانایه
به  پارێزه رت  .

# چاخــه ڕێ

## قوبادی جه لی زاده

زامی بن زگ و سه ر پشتت
ده لێ ی کوڵکی خوێن ئامێزی قه سابانه
ئۆردووی مێشی تێئالأون .
ده زانم کۆچ .. هه ڵگران و هه ڵدێرانه
کۆچ .. مه رگ و هه ناسه دانه .
چارم نی یه ، ده بێ دیسان
له وه ڕی ئه م بژوێنه شینه ت بکه م .
راسته گوتم ؛ من قه ره ج نیم
به لأم چبکه م
کراسێکی قه ره جانه ی گوڵهه ناری یان له به ر کردووم .
ده لێ ی رۆحی نه فره تلێکراوی سیزیفه .. دووله ت بووه
پارچه یه کیان تێکه لأوی خوێنی من و
له تێکیشیان ئاوێزانی ، قاچ و هه نگاوه کانی تۆن !
ڕێ ی ساکه گۆڕو نشێویش
که هه ناسه ی سواری من و شرقه ی ناڵی تۆ ده بیستن

ده بن به ڕازو مه رگه ڕێ.
ده زانم تۆ چ قه ره جی قه لب به خوێنت نه دیوه ..
من قه ره جی ڕشانه وه ی سه رده مێکی شه ل و کوێرم .
ئه من ته مبوورێک ده ژه نم .
که لله سه ری مرۆڤێکی هه زارمێرده.
ژێ ی له برژانگی خانزادو
نرکه ی مه م و قیژه ی سێوێ ی دڵ به کێرده .
ده زانم تۆ چ قه ره جی کێوبه کوڵت نه دیتووه .
پریاسکه ی من ، پڕ پێناسه ی په ڕه سێلکه و
ئه وان کۆتره باریکانه ن
گه رداوێکی هه ناسه ره ش په ڕو باڵی تێک شکاندن .
نێوچاوانمان سوێر کراوه ..
نه من شه وێ سه ر به قوڵی خه ونێکی پەمبەیی دەکەم
نه تۆش ڕۆژێک به ئاسووده یی ده زه ڕیت .
ببووره گه ر پێمان له به ردێک هه زره لی و
کەندالێکمان پڕ کرده وه !!
ئه م سه فه ره ش – برای گوێ درێژ –
ببووره گه ر ،
دوا وێستگه و .. دوا سه فه ر نه بێت !!

# داری ساری

پەی چەرخی گەردوونە رۆژی یەک رەنگە
گا دەشادنەفا وگا نار دتەنگە
گا تەرمە چیۆ پەنیر گا سختەچۆسان
ئەوقیانو سیگەن پر لە نەخنکە

* * *

کارەوانی ژین ماوەی تی ئەژیت
گەر لە تی ماوە تیژبێوت وبریت
برییت ریگای ژین بەکرداری نیک
ئەوسا مەزانی بەئەومید رەسبیت

* * *

گەردۆن دەمیگدن لە ماوەی ژیان
هزاران فرسدت تیدا دوۆ عەیان
ئەگەر نەگرنی لەژین باجی ویت
لەدلّ مەمانوّ چیوّ دافی گران

* * *

لەی ژینە بیلا درێونت پاکە بوۆ
کردارت زلات دۆیرت رونال بوۆ

چیــۆ مۆم پـ ـ، رونای میلدت خوه ت سـوزن
نـــه قه لات پی گه ل مـه لۆ ه ندو خاک بوو
ئـه گه ر له ی ماوه باجی وییت سه نـــی
لــــه مینای ژیـــان نونـشه ی هه لکه نـی
ونــــه ک هـــه ر چــه ندي سـامان کوۆ کردی
گـــشتی مـــه ما نۆ پي شه خصـــی هه نـی

* * *

باجـــی دیـــیت به سیـــن به ره فتاری پاک
تالـــه تاریکـــی گۆر ریـــگات بوۆ روناک
لهٔ ماوه ی ژینت هه رجه ند هـــه وڵ کـوتـی
هیۆچ نیه ویی وگه رد نه جفـت ونــــه تاک

* * *

دیڵی دست به ســـت ی ماڵـــی دونـیا نه وو
رفیق ناکـه س چـــه تـــه دگومـــرا نـــه وو
یاسای راســـته قلـــبی لـــه دڵ داوه ر کـــه
نائه ومید لـــه رزق ورۆزی خـــودا نـــه وو

* * *

لــه چـــرکی دونـــیا پــاک گــه درێونـــت
گومان نه شکـــدنی کومــاچـــه ی ســـێونـــت
وکــۆ مـــۆم بـــه ســـوز پـی روناهی ریی
له خـــه لتـــی زیـــان پاک ئه وکـه خیونت

وگه رد هـــام جـــه نت مبهـــریانـــی کـــه
گـــه له هـــوکـــاره ی باس نیشتمانـــی کـــه
بـــه کـــردار نیـــک هـــو کـــاره ی گـه ل که
ته رکی ته مای ئه رکی دونـــیای فانـــی کـــه

*　　　　*　　　　*

له مـــاده ی ژیـــان مـــاوه ی ئـــه میـــینی
لـــه ی مـــاده ی هـــه ربای باچ لیش به سینی
ئه گه ر نه سه نی کـه ژین باجـــی وییـــت
ونه گ له دیومات چیه شـــتی نـــیه میـــن

# من هێلانەی عیشقێکی هەڵفڕیوم

صلاح محمد

هەردوو دەستت وەک ژورەکەم .
بۆ چۆلەکەی
دلێ سەر لقی کچێک ئێواران
بکەرەوە .
نەبا سەرما
گۆرانی یەکانی ناوسنگی رەق کاتەوە
دەنگدانەوەی عیشق ببیبەستێ
دڵ وەک سواڵکەرێکی بچکۆلە
وێستگەی سۆزی کەسێ نەبێ
کە گیانی پڕ بوو لە گریان
بۆ تاوێ لە ژێریا راوەستێ
تەنیایی وەک بەفر ئەبارێ
رێگاکان بەرگی بوکێنی

نۆشه ویسته که ی من ئه گ
ته م نه کو من ،
بگره شارێکیش دائه پۆشێ
بۆیه تابێ وه ک فه ناره
چریسکه له گیانم هه لئه ستێ
هه رچه ند له م ده ریا شێته شدا
به له می تۆ ناگا به من ،
تا ڕاوه ستێ
تۆ ده خنکێ ی
به لام چیرۆکی ئه م عیشقه به کێ ئه لێ ی ؟ !
ڕۆ ئه چی
ڕۆ ئه چی
ڕۆ ئه چی
به قولایی ڕوبارێکی شێتا ئه چی
مه راقێکی هه رگیز بچوک نابیته وه ،
گه وره ئه بی
وازبێنه .. وا
له که ناری ئه م چوڵستانه ی ته مه نما
( با ) خه ریکه گه لاکانی ڕوحم ئه با
چاوه کانم وه ک په پوله
س له ده وری سه رت گه ڕێن

تۆ تەواو نابی ئەبیمە،
چۆن ئەسوتێن
(با) ش ئەکەیتە گۆڕستانێکی کۆچەری
تا ئارەقەی ماندوو بونی
ناموّیی خۆتیان پێ بسڕی
ئێستا شەوان
کۆترێ دێ
لە چاوانم ئەخواتەوە و
لە شەقەی باڵ ئەداو ئەفرێ
ئەوەندە لێ ی وورد ئەبمەوە
سۆزێکی شێتانە دام ئەگرێ
پەنجەکانم وەک میرولە
برسک لە هەموو گیانم ئەبرێ
کاتێ تەماشای خۆم ئەکەم
بومە تەچەند هێلانەیە
کەسێ نی یە تیا بگمێنێ
بۆیە ئێستا وێرانەیە
ئەی کۆتری عیشقە بێ ناو نیشانەکەی من
بە گیانی تۆ ،
وێرانەیە
بڕوابکە ،

ویرانه یه ، ویرانه یه .....
ئه وه نده تۆ له من ئه چووی
نه مئه زانی
ده می هه موو ده ماره کانت لا دانیێم
تا لیێم وون بووی
ئه ی هه موو ئاسمانه کانی بیرکردنه وه
بۆ به ته نها سه دای شه قه ی
باڵه کانی
ئه و خۆشه ویستی یه ناموێیه ئه ده نه وه
جونکه ناتوانن کوتم که ن ؟!
یاتازه شم بکه نه وه ؟!

# زریان

شیعری : أحمد باوه ڕ

که لا ر

بڕوابکه ن
ئه گه ر زریان له زمانی هه ژارانی
بزانیبا
قه ت ڕه شمالی تێک نه ده دان
ئه گه ر زریان لانه وازو ته ڕیوانی
ئه م زه مینه ی بناسیبا
خۆی ده کرده هێلانه و کوش
خۆی ده کرده په ناو هه یوان
خۆی ده کرده نان و ئاوو
توێشه به ره ی ڕێگای دووریان

* * *

بڕوابکه ن
ئه گه ر زریان وه رزی سه ختی به سته له کی
بناسیبا

قه ت نه ی ده هێشت خۆری به هار
له سه ر لوتکه و که ناری شار
ئاوابێ
قه ت نه ی ده هێشت ده ستی خه زان
گه لای داری ئاسوده یی
هه ڵوه رێنێ
*　　*　　*

بڕوابکه ن
ئه گه ر زریان بیزانیبا به رده هه سان
چۆن داسولکه تیژده کاتن
ئه گه ر زریان بیزانیبا
کۆتره شینکه له شوێن خه رمان

وورده دانوو
چۆن هه ڵ ده گرێ و
بۆ هێلانه و بیچوه کانی
چۆن ده یباتن
قه ت نه ی ده هێشت گوڵه گه نم مێرگ و جاڕو
کوشی گه رمی ئه م هه واره به جێ بێڵێ !! ؟

# کورته چیرۆک

## عه بدوڵلا سه ڕاج

کوتره سپی یه کانی زه رده ی ئێواره که به کاغز ده چن که مێرد منداڵێک یجه توون له سه ر بانی ماڵیانه وه هه ڵیداته خواره وه . دواین تیشکی ڕۆژ وه ک ئه وه ییپه له ی بێ ، که شه که ی شێدار ده کرد . که ناری دیواره خوساوو تلوقکی دره خ هه ڵله رزیوه کان زیوه ر ده بوون . ئاسۆی خۆراواش شه لاڵ و خه ڵتانی خوێن ده بوو . ئاله م کاته دا ، ئاسمانی ئه و ئێواره یه زه ریاچه ی جیوه بوو .

ئه ز به دیمانه ی ئه و شۆخه سه رسام ده بم که له ناو ئه و شووشه به نده دایه . چاوه ڕه شه کانی ئه وه خه رامانه وه کو ته زووی کاره با ڕامده وه شێنێ . به ژنێکی ڕێک و پاراو .. گه ردنێکی قازیقوڵنگانه ی سفت و بێ گرێ .. که راسه که ی ده ق وه ک تابلۆیه کی نوێ ؛ ئاوتوێ له گه ڵ چاوی ڕێبواراندا ده کرد . ئه وه ی که مه ند کێشی کردم و گۆشه نیگامی وه رگه ڕانده کن خوێ، بزه یه ک بوو له و بزه پڕ نهێن و داخراوانه ی که چه ندان بۆچوون و لێکدانه وه له هه مێز ده گرن . ده رحاڵ ، ئه و شۆخه م به موتالیزایه ک هاته به ر دیده . له عاست خۆم سست بووم ، به ڵکو سڕ بووم و نیگام له موله قدا وه ستا . باش چه ند هه نگاوێک ، ئاوڕم لێدایه وه و به خۆم گوت :(( ڕێکه وته . ڕه نگه ئیدی وه کو دوو هێڵی هاوشان نه یبینمه وه – جا با ڕوخساری نه بینمه وه ، چده بێ !)) هه ر خۆم به خۆم گوته وه :(( چۆن ! ئه ی .. )) نه مزانی که سه سۆزمه نده که ی ناخم ده یه وێ چی بڵێ به که سه

هـ‌ؤشمه نده که ی هاته ریبی ! بۆیه له حزیه وه ، وێنه یه کی ره‌[illegible]و ڕاکێنمه ڕو
ئه فسووناویی بۆ ده نـه خشاند وه ک ئه وه ی ؛ ئه و نازاداره به چاو خه نده باراتم
بکات و به مرواریی دگانـه کانی قه پی حه ز له گیانم بگرێت ! ئیتر زۆر نیگاری
ره نگینی له و بابه تانه ی کێشا بۆ ره وت و له نجه و کریشمه و نازی . خۆ له مه ڕ
په یکانی مژۆڵه و هه ودای قژه ره شماره په شێوه که ی هه ر مه لێ . مه مکانی وه کو
جووتێ باره که وی بزێوو نه سره وت ؛ کێشا که تووشی داوی سینه ی ببوون ، بۆیه
هـه ر ده م فڕکه یانه و ئـارام نـاگرن له و بـه ندایه تی یه و لـه قه بۆ قـه بۆیان
ناکه ون .

لایه نه هۆشمه نده که ی ناخم ئاڵۆزکایه ئه و قژو بسکانه وه و به مێدوزای زانی
که هه ر تاڵه موویه کی سه ری ئه و ئافره ته ده عجانه یه ، تووله مارێک بوو به
چوار لادا زمانی درێژ ده کرد . ئیستاکه هه ر دوو لایه نه که ی ناخم ، هاوسه نگ
وه ستاون و ، ئه گه ر به پاشقولیش بێت ، هه ر یه که یان ده یه وێ نایاره که ی
خوی بخاته رکیفی خۆیه وه .

(( که نیگای تیگرتی ، ٠تۆ که وتیته هه ناسه برکێ و ... ))

(( تۆش دڵه کوتێت بوو ! ))

(( داره به نی به ژن و بالأی چۆن ده بنه بزوێن و چه راگای چه لاتدنی هه سته
تامه زرۆو تینووه کانت . ))

((هه ردوو چاوی ، جووتێ زنه کانێن که ئاوی له ش و گیان ده مژن ! ))

(( ده بـزانـه هۆردووکـمان بـووینـه ته یـه ک جـه مسـه ر بـۆ ئـازاردانی ئه و
به سه زمانه ی که پێشتر ئارام و گۆشه گیرو بێ خورته بوو !! ))

(( وایه ، به لأم که سێکی پیری وه ک ئه و ... ))

(( تـۆئـاماژه بۆ تـه مـه ن ده کـه یت و بـه تێـردی داب و نـه ریت و ئـایین
نه شته رگه ری ده که یت ! ))

(( ده بزانه تـۆش ده بێته کۆسپ و ئاسته نگ لـه بزاوتی ژیانی دا . ئه و به
دزه چرایه ک گه رمایی تێده گه رێ و تـۆش نـیازت وایـه بیکـه یته کرمی
به فرو له ناو به سته ڵه کی نساران دا بمێنیته وه ! ))

هه تاکو ئیروکانه ، ده نگم له خۆم بڕیبوو ، وه لێ که به کرم دانرام ؛ بگره کـرمی
ناو به فری سالێ خۆر نه هێو ! یه کسه ر ڕاچڵه کیم و به ده نگی به رز گوتم : –

(( ئافره ت له گشت کات و شـوێنێکدا ، په رستگاری خۆشه ویستیـه و ڕوهگای

دڵــه شــه یــداکانــه . دڵێک کانــگای، ئــه ڤین نــه بوو بیــگومان ، سرووشان نــاگرێته خۆی و ئه فرانــدی تێدا جیێ نابێته وه . بــا به بــاڵیێ ئه نــدێش و خه یــاڵ بــیێ ئه ڵبه ته ئــه وعشیقه ده بێــته ماکی مســتیێ پــه یڤی گــڕ گرتــوو یان پــه خشانێــکی جــۆشێن .. هــیچ نــه بــیێ یاداشتێنکی ورشــه داری لــه پــاش ده مــێنیێ . ئــه وانه گشت چرکه یه کــی له بیر نــه چــووی ئه و مرۆیه ن له وورووژانی هه سته دانه مرکاوه کانی دا . )) تۆ ده زانی ئه و بیر کردنه وه و گفتو گۆیه ی ناوه وه م،کاتێــکی کــورتی خایاند ! به ڵکو چه ند چرکه یه ک بوون که ؛ له ناکاو چریکه ی ملۆچکه یه ک بێنده نگی یه که ی هه ڵبزرکاند ! به ئاگا هاتم .وه ک بڵێیٚ ی ئه و چریکه یه ، به تاڵه موویه ک به ئاسمانه وه گرێ درابێت ، سه رم بڵند کرده وه . کۆتره سپی یه کان ئه م سه رو ئه وسه رته راتێنیان تێدا ده کرد که پێشتر به ورده ی کاغزم چواند که منداڵێکی فه راژی ی چه توون په رت وبلاوی کردبێته وه . له و لاوه ش ، هه روێکی بیێ شێوه ی خوڵه مێشی؛ سکی داپووه بان خانگ و گوێسه بانه کان ، به جۆرێک مێناره ی گه ڕه که وادده هاتــه پێش چاو که له ورگی ئه و هه وره مۆنه چه ڤی بێت ! ئه م دیمه نه ،بۆ ماوه ی ترووسکه یه ک تــه ســه لای دام و جۆششی ژووره وه ی هێورــاند وه ک چــۆن ئاوی کــوپه ڵه یه ک ده پرژێنێته سه ر په نگری گه شاوه . ناوهه لانه ، خامۆش بووم و دامرکامه وه ئێستاکه کێژه که ی ناو شووشه به نده که م لێوه دیار نی یه ! ده بیێ له ڕه گه زی مار بیێ و جێگای بۆ نه بێت !! خۆ نه نکه حه وای له گه ڵ ماره دێرینه که دا هــاوبیر بــوون له ته فره دانی ئاده م و ده ربه ڕاندنی له و به هه شته دلاّرایه ی که ڕووباری هه نکوین و شیرو نــارانــم چی وچی ، ڕاست و چه پ ده یبڕن ! ئا لــه و ســاوه ، یه که م تۆوی یاخی بوون چێندرا و بنــیاده م کۆڵی لێواو لێــوی ئه شکه نجه و پریاسکه ی زامێکی گه وره ی که وته ئه ستۆ و ، به نیخه نیــخ ئه م تاراوگه یــه ی تــه ی ده کــات . تاکه وێستگایه ک بۆ پشوو دان و هه لێکی حه وانه وه ی هه بێت له م دۆزخی ژیانه ، سه یوانــه ڕه نگینه کــه ی ئه ڤینه که وه کو جادوو ، ئه و بنیاده مه کڵۆڵ و داماوه ده گه ڕێنێته وه ئه و بــه هه شتــه ی کــه ده رکــه یان لیێ داخــست . ئاوڕێــکی دیــکه ده ده مه وه . ئه وه تا له جێگه ی خۆیه تی !! ئه مه چی یه ! پێشتر بۆ ون بوو !! وا بزه یه ک ده کاته په پووله یه کی په مه یی و بۆ لای منــی ده نێــریێ !! ده ی .. ده ی لێت داوه .. دیاره له م شاره خه ه ندانه و له م پاشاگه ردانی یه دا ، دلاّن زوو به یه کدی شاد ده بن ، سه ره ڕای ئه و په تایه هارو هاجه ی که بلاّ و بۆته وه له مه ڕ

ماوسەدنی گیرفان و تاساندنی گیانی هەلە کاری و بە زە یی و چی ! ئە منیش خویچە ی
بزە یە ک لە رووم دە بچرم و بۆی روانە دە کە م .ئە و وە کو پلنگیگی نیوە راهینراو
دینە ناو ئاشیانە ی دیدە کانمە وە پلنگیگی پە لە پە لە ی ناو قە د باریک و نە شمیل .
دە لین گوایە پلنگانی بیشە بۆ دە سگیر کردنی نێچیرە کانیـان ، هە لمە ت و بـازی
ئیجگار بە رین دە دە ن . بـاشە ، ئە ی بۆ ئە م پلنگە ی من لـە م پاییزە دا پە ق
راوە ستاوە ! چاویش لە من ناترووکینیٚ !
(( بگە ڕێمە وە - نە گە ڕێمە وە - ئە ی چی زوو بگە ڕێوە - بە قسە ی فریو
نە خۆیت ))
دیسانە وە ، جووتە کە سە زۆر بلێکە ی ئاخم دە رفە تیان بۆ رە خسا کە دیتیان من
وا کە وتوومە تە گژمی دوو دلیٚ و گومانە وە .
(( بروٚ .... مە ڕوٚ )) بروکان یە ک دوای یە ک ، لە چە شنی دە نگدانە وە ی
دولێکی نیوان دوو کە ژی سە خت و هە لە مووت ، ئاوها زالٚ بوو بە سە ر دە نگی
نە روی هوشم و راست وە رگە ڕام و دووسی هە نگاوم هە لهینا . دە نگی کە سە
هوشمە ندە کە بە تە واوی برڕا ، کە چی دە نگی کە سە سوزمە ندە کە بووە موسیقایە کی
راکیشی هە نگاوە لە رزوکە کانم . هە نگاوینگی دیکە و لە چە قی شوستە کە دا وە ستام
چاوم نووقاندو هە ستم لە خوم گرت . خوٚم لە دونخیکی وادیت کە ئە و پە ری یە ،
سە راپا شانە و موٚخ و دە مارو مـوو لوولە خوێنە کانمی گرتوتە وە و جلە وی گیـان و
بوونمی بە دە ستە وە یە . پە یتا پە یتا کیوبیدی چاوە تیراندازە کانی دە میپکن و ،
نوقمی دە ریایە کی سە رمە دیم دە کە ن و ، لە ناو شە پولی زنڕی تیژاپدا دە تویٚمە وە.
هە ر بیر کردنە وە یە ک لە ناو گە وە کانی میشکمدا دە بێتە تە راویلکە و زوو بـە
زوویی بزر دە بیت ! لە چە شنی زرە خە ونیک بیٚ بە یاني زوو تە م ئاسا لە یـادم
پرە وێتە وە . هە ست دە کە م لە زە وی جودا بوومە تە وە . هە ست دە کە م پە پرم
گرتووە ، وە ک سروە ی بە یان سووک و بیٚ کیشم ! هە ست دە کە م پێبە ندی
جیکات نیم و لە گشت چاخە کاندا دە ژیم .. لە رابردوودا ، لە ئیستاو داهاتووش.
هە ست دە کە م کە هە م وە کو مروڤیکی سە رفرازی سنوور پە ڕێنی دزیوی بە زین.
لە م کە ین و بە ینە دا تومە ز هە ورە بوزە کە بە یـە کجارە کی رە نگی ئە و
گوزە رە ی هە لمژیوە و خە ریکە بە نمە بارانیکیش ! پتر بوونی خوٚی بچە سپێنێ .
ڕکم لە باران بووە .. بە خوٚمم گوت :(( باران لە دوٚخ و جیٚ یـە ک کە لک بە خش

که دیبه رو کێڵگه کان تێنوو بن . ڕه زه کان چاوی سه وزیان له جه گی ئاسمان ببڕن . نه مامه دارگوێزه کان جوانه مه رگ بوو بن به ته ک دایکه کوتره و کوێ زوخاله وه . ڕه زو بێستان و شیناوه رد نه بوو ، باران گران و تووکی تاڵ ده بێ . ئه و هێمایه ش که هه یه تی له مه ڕ فه ڕی و ئاوه دانی یه وه ، هیچ نه بێ له کن یه کێکی وه کو من ، له هه ڵ و مه رج و ڕه وشێکی وادا ، به پێنچه وانه ده که وێته وه . دابارینی به خوڕو شه ست و لێزمه و ڕه هێڵه و باهۆزو زریان و کڕێوه ترسنم ده که ن . ده ئاڵۆزێم ، له وانه یشه چاوی یاخی بوون له ئاسمان بگرم و سه رگه ر مانه به ڵکو شێتگیرانه هه ڵسوکه وتی له گه ڵدا بکه م . تۆ ده زانی دیمه نی ڕۆژگاری مۆن و شێدارو ته م و مژاوی ، بۆ جۆن ڕوخساری ئاقوڵاو خه فه تخانی شه مشه مه کوێره م ده خاته به ر چاوان ! به تایبه ت دیمه نی باله ته نک و لینجه کانی !! له ساتێکی وادا ، ڕوودم وه ک دیوارێکی بۆیاخ وه ریو ، هه ستێک ده نابڕێ . ده سێرکه ، ئه م هه ست و ده ربڕینانه له وه وه ئاخمیان داگرکردووه که ده بوایه له باڕو دۆخێکی وادا دوو که س به یه ک ده گه ن ، پێویستیان به داپران و جودا بوونه وه هه یه بۆ ئه وه ی هه ریه که یان هه ست و شعووری خۆی هه ڵسه نگێنێ به ڕانبه ر به وه ی دی . ئه وه بوو من ئه وه سنووره م شکاندو هه نگاوه کانم بوڵای ئه وم ده به ن ! ئه وی له م کاتانه دا به توندی ڕامده ته کێنێ ته نیا ڕاستگۆیی یه که مه و به س . ڕاستگۆییم له گه ڵ ناخ و ویژدانی خۆمدا ، به نموونه ی ڕاستگۆیی دوو چاوی گه ش له گه ڵ هاووێنه که ی خۆی له که رته نه ینۆکێکدا . چوومه به ره وه و یه کراست بووینه نه ینۆک و بالاڕوانی یه کتری . من له و ده ڕوانم و ئه و پشکۆی چاوه کانی لێم ده گرێ . چه ندی خایاند . نازانم به لام هه نده م زانی ، ده نگێک گوێمی ده رزی ژه ن کرد !

– کابرا .. بۆچ وه کو داوه ڵ له پێش ئه و وێنه یه دا سڕبووی ؟!

هاتمه خۆم و نه مزانی چۆن وه ڕامی خاوه نی ئه و کۆگایه بده مه وه . ملی ڕێگام گرت و جار نا جاریش ئاوڕم له هه ر دوو چاوی شۆخه که ی ناو جامخانه که ده دایه وه . له من وابوو که پشتی لێده که م ، خه ده نگی ئه و جووته چاوه ی ناوشانم ده سمن . خۆزێ هه ر که یلی ئه و ئه ڤینه خه یاڵی یه ده بووم و ، ئه و ده نکه که ژاوه ی خه یاڵه که می به ره واژه ناکرد . تۆ ده زانی خه یاڵیش به شێکه له ته مه نمان . ؟ .

کانوونی یه که می ١٩٨٨

هه ولێر

# خونچه چیرۆک

## *سابیر ره شید *

### ١- چیرۆک

خوێنه ‌گه ر جیرۆکنووسیش نه بێت ده توانی ئه م چه ند سه ره داوه بکه ی به چیرۆکێکی ئاسایی چونکه کاره ساته که زۆر له وه درێژتره که من به چه ند دێرێک بۆت بنووسم به کورتی « لاشه ی کچێکی خلتانی خوێن ... ته مه ن چوارده ، پانزه به هار .. جێ په نجه ی چه ند درنده یه کی به شێوه مرۆڤ .. شێوه ی ڕاکشانه که ئه وه ی ده نواند که به زۆری کچێتی لێ دزراوه .. » .. چی تریش که به خه یاڵتا دێت بیخه یته سه ر ئه م به سه رهاته راست ده که ی .

سه ره تاو گرێ چن و کۆتاییه که ی له مێشکی خۆت دا به یه که وه یان گرێ بده ، ئه وسا ئه گه ر ئه ش بوو به چیرۆک ئه وه دڵنیابه ده بێ به رۆمان .

### ٢- دیوانه شیعر

شاعیره که دوای ڕێگادانی دیوانه شیعره که ی چوته تی به چاپ گه یاندنی بوو به ئه ژدیهایه ک و هه موو شه وان له گه ردنی ده ئالا.. « چوتی به چاپ بگه یه نم ؟ ده بێ پارمه تیم نه ده ن ! » .. «نه به خوا نایده ن ، کاکی خۆم با ئه نگوستیله و هه ندێ له وورده واڵه بفرۆشم ، ئێ خۆ چه ند کتێبێکی زیادیشم هه ن خه ونه که م دێننه دی .. » .. سه ره نجام کتێبیش فرۆشران و کتێنجانه که شی هه راج کراو په نجه که شی بێ ئه نگوستیله مایه وه بۆزه دیوان هه ر چاپ نه بوو ، به لام پاره که ی که وته گیرفانی برای شوفێرو کاکی مه یگێڕ .

## ٣-ناميلكه

دووای چه ند مانگێک سه ری لـه کتێبخانه کان دا بـۆ ئـه وه ی ئه ختێک لـه پاره ی فرۆشتنی ناميلکه که ی بکه وێته وه ده ست و لایه کی قه رزه کانی پێ پـڕ بکاته وه.. که چی خاوه نی یه که م کتێبخانه که سه ری لێ داو به زه رده خه نه یه کی گه رم و توزێک شه رمه وه داوای نرخی کتێبه فرۆشراوه کانی کرد ، ئه ويش بـه فيزێکه وه پێ ی راگه یاند که کتێبه کانی بباته وه چونکه قوژبنێکی چاکی لــه کتێبخانه که داگیر کردبوو .

## ٤- تابلۆ

له پيشانگاکه دا خه لکی هه موو یه ک به یه ک سـه رنجی تابلۆکانـيان ده دا ، ئه ميش تا داخستنی پيشانگاکـه نیگای چاوه کانــی له یه کێک لــه تـابلۆکان نه ده تۆرا ، ئه وه نده ی سه یر کرد تا تابلۆکه بوو به به شێکی پڕ له کاره سات له ژيانی ئه و ويستی تابلۆکه ته واو بکات بۆیه پری دایه ئه و چه قۆیه ی بـه پشتی تافرته که روو چووبووه خواره وه .. وه کو شێت ده ستی بۆ چه قۆکه بـرد که له جه سته که ی بێنێته ده ره وه ، به لام له گه ڵ تاودانی ده ستی تابلۆکه که وته خواره وه ئه وسا گه رایه وه دۆخی جارانی و هه ستی پێ کرد تابلۆکه گیانی به به ردا نيه . ! .

## ٥- په یکه ر

په یکه رتاشه که دووای ماندووبوون و شه ونخوونيه کی تێبجگار زۆر قۆناغی یه که می په یکه ره که ی ته واوکرد .. به لام نه يتوانی له به ر ده ست کورتی قالب رێـژی بکات .. چه ند ساڵێک هاتووچووی ئه م لاو ئه ولای کرد تاپاره ی بـۆ بپرنـه وه و گوزه پانێکی شاری پێ برازێننه وه .. سـه ره نجام په یکـه ره که ی بـۆ منالانـی گه ره ک بوو به بوکه شوشه یه کی چه ند ساتی .

## ٦- ئه کته ر

خوليای هونه ری که وتبووه سه ری ، به رده وام بن هه نگلی له گۆڤارو رۆژنـامـه بترازێ جێ ی چی تری لــێ نه ده بووه وه ، هــه ميشه لاسايـی هـونه رمه نـده مه زنه کانـی ده کرده وه ، دووای ئه م سه رنێشه و سه رقاليه هه ر به کۆمبارسی ، به لام دڵی به وه خۆش بـوو دووای داوه ت کـردنی ده رهێنه ره که یـان ده ورێکی

سه ره کی پیێ به خشرا ..که چی دووای دوو مانگک پرۆژه پیێ یان راگه یاند له به ر چه ند هۆیه کیێ هونه ری شانۆگه ریه که پیشان نادرێت . ! .

## ٧- په راوێز

ئه مجاره یان زۆر له جاران به هه وه ستر دیده نی کرد ، ئه و گۆڤاره شی پیێ بـوو که بابه ته که ی تیا بلاٚوکرابووه وه ، به نازێکه وه لاپه ڕه ی یه که می ووتاره که ی خۆی خسته به رده می مامۆستا ، جه نابی مامۆستاش هه تا دووا لاپه ڕه ی هه لدایه وه تا گه یشته په راوێزه کان و یه که به یه که ی خوێنده وه و گۆڤاره که ی فڕیێ دایه وه پێشی و پێشی گوت (( تۆ که ی واز له م جۆره نووسینه بیێ تام و چێژانه ناهێنی .. کاکه تاخر لاوازه و خۆشت نازانی چی ده لیێ ی .. )) . کـاکی نووسه ر به ولشکاوی هاته ده ره وه و به هاوڕیێ که ی گوت ((ئیێ خۆ مامۆستا گه لیێ لـه نووسینه کانـي من رازیه و به رده وام پێشم ده لیێ ئافه رین ئـه م کرداره ی ئه مجاره ی یانی چی !؟ )) .. (( دیاره ئاگاداری ئه وه نیت که تۆ له په راوێزدا پێش ئه و ناوی ئـه و مامۆستایـه ت بردووه کـه رقیان لـه یه کتره و دانـویان به یه کموه ناکولێت . )) .

# تایێ به رویێ

## چیروٚک

. جلال مصطفی.

هه روه کی چویچکا ژی دزانی دیٚ ته حلی یه کا دژوار بیته میڤانه کیٚ دارگران و خو ل سه ر دلیٚ ڤی واری پـه حن که ت ، لـه و تـایـینت نـزم و بـن سیـڤنده هیلان وهیلینینت خو ل جهینت ئه ڤرازتر نژنین ، ب هیڤی یا هندیٚ هیـکینت وانیـت بچوک بینه تیژک و تیژکینت وان چاڤینت خو ب روناهی یا روژیٚ کل بوه ن ....

خه لکیٚ گوندی ب ژن و میرڤـه وه کی میشا هنگڤـینی تیـک دهاتـن و تیـک دچون ، قویتیٚ زڤستانه ی ته ـحل و دژوار ڤـه دجه ماند . بـه لگـینت زه ر بیٚ ئانه هیا خو ژ تایینت دارا دڤه ره ستن و ب مه لو لی دکه تـنه ئـه ردی .. تـرس دارئا لینک بو ب دژواری خو دهژار گوندی ئالاندبو .. خـه م دیـوینت کرنتـن و ب که ریڤه ل دورینت سلوی دله یزین . ئه ڤه ده مه که سلوینی چاڤیٚ وی نی چه پیٚ ئه ڤرل سه ر ، خه ونینت ب ترس د بینیت .. به لیٚ دهیلانه ددلیٚ خودا و نه دویریا بو که سیٚ ڤه گیریت .. وی سپیریٚ تژ دلیٚ وی گرک بو ده میٚ ژ خه و رایری ، ژناوی هات ناڤ ده ریٚ :

شڤیدی من دخه ونیا ددیت ئا ڤ ژ ته نویرا مه دزا .. یاره بی خیٚر . هـه ردو نه ڤینت خو نخاڤتن و ده رکه تـه ده ریٚ خانی . گوند گـورستانه کا مـته .. بـاویـاکوریرکه وه کـی ده وارنت شه مبوز خوتـینک وه ردکه ن و به ژتینت داروبـارا ژنیڤه کیٚ دچه مین .. سه ریٚ خو بلندکر ئه سمانی یی زه ربوی ئه ڤرینت دخورنه ناڤ چاڤینت ئیک پیچه دنیا یا ئاری .. ئه سمانیٚ ئـاریاری و لیٚ ڤیژینت ب سـه هم راد هیلیت .. چکینت بارانیٚ په قیشکا ل ئه ردی چیدکه ن .. ئاڤ ب له ز یابلندبیت .

ل سه ر پیٚ خو زڤری دژورڤه .. وی و ژناخو ملینت خو دانه ئیک و بو خرِ خرِا

ئه نه کێت وان ئاڤێ ژخانی دهاڤێن . هه رو دو بچوک ژخه ورابون ولێ قیژیاێ دان ...دانه جهه کێ بلند ... ژنک شاش بو ..

پێلاڤێت وان د ئاڤێدا به رزه بون وخرخرا ئه نه کێت وانه .. دا دچوکێت وانراو خرخرا ئه نه کێ وی یه .. دا دشویتکا وی را ئه نه که هاڤێت .. ب چاڤ تاریکی گه هشته هه ردو نه ڤێنت خو و لبه ر ملێت خوکرن و ب هه وارکی قیت کره ژده رڤه .. شره ڤێن و پره ڤێن ێت ژئه سمان دچن و گرگرا نه ڤرایه برویسه یێ ڤه دده ن و روناهی ێت که سک و سورو زه ر ژێ دچن ، به رپێت وان رون دکه ن .. گڤینا بای دبه را گوهێت وان را دبوریت و دگه هیته بن ده ر سوکێت وان و دچیته دبن چه رمێ وانڤه .

ل په رێ گوندی ژنکێ کره هه وار .. قیژیه کا بلند راهێلا .. ل سه رملێ خوزڤری که س نه دیت .. هه کو یێ مه زن دناڤ چیکێت بارانێ را ده ستێ داپیرام خو ئه وێ ب سه ر ئاڤێ که تی دیتی ژبنێ پیا کره قیژێ : پیرێ ... ده نگێ وی ب سه ر ده نگێ بروسیه یا که ت و ل هه می دول و نهالا گه رپاو ل که ڤرا ده نگڤه داو زڤری ئه گوهێت وی .

سلوبێ چاڤێ وی ئه ڤر ل سه ر ده لیڤا هزرکرنێ نه بو .. ێه وشیاپسیار بکه ت کانێ خه لک کیڤه ئه قیای نه .. چه نه د مانیه چه نه د چوینه .. دێ کێ ببنیته ڤه وکێ نه .. ڤان هزرا هه می یانه وشیا بکه ت .. تنێ ئه وتێنه بیت کانێ دێ بارێ خو ل کیرێ دانیت کو ئاڤ نه گه هیتێ .. گڤینا بای لێ نه بیت .. برویسه لێ نه ده ن ، روناهی ێت که سک و سورو زه رنه بینان .

داڤه کا زوها نه مایه دبه ... شرکێت ڤ پشت یاتکێت واندا دچنه خارێ .. چیکێت ئاڤێ ژ رویشیێت ده رسوکێت وی سورێ دفنێ و سجێلا دکه ڤن . هه ردو کورک ب سینگێ شداندن و سه رێ خو داوی ئه ڤرازێ رک ئه وێ دچیته وێ شکه فتا دکه ڤیته چیابێ پشتا گوندی . هه تا گه هشته به شکه فتێ برێڤه دوجار ئه حسی جارا دوێ شیاخوڤه گریت به لێ یا ئێکێ ده ڤ و ده ڤ چو .. هشنا بارانێ ئاخا شکه فتێ ئه ر ئه کریه .. کژی تیڤه خولیا ئاگرێت شڤانانایه .. ده نگێ بای و برو سه یاو لویرینا گورگا ل وارا ده نگ ڤه ددا .. هه کو ده نگێ گورگا دگه هشته گوهێت زاروکا مویێت سورێ وان رادبونه ڤه و چه رمێ له شێت و انیت بچوک تێک دچون ..

یێ بچوک گوت :

رباپیر ئه زمیْ برسی مه ..

ل ده ریْ شكه فتیْ راوه شتا ده سیْت خو ڤ چاڤیْت خودا ئینان و ئاڤ ژیْ ڤه مالشت .. بینهنه ک هه هه لكیْشا ، پاشی خه یه ریْت كریْت گوتنه به ختیْ خوو گورگاو برسیْ و روناهیێت كه سک و سوروو زه رو بروسی یا . ئه ز چ ل هه وه بكه م ! هه لكه روژه كیْ من هزر ئه كریه كانیْ گورگک هه نه یان نه ؟ .. یابویه دیروک بو خه لكیْ گوندی هه كو ل روژیْت ئه حلی سلوییْ ئه ڤر ل سه ر چاڤی ب گوپالی گورگ ژگوندی ددانه پاش .. هه می تشت ل به ر شیلی بون .. ئه ز ژی بیْ تیْهن و برسی مه .. ئه ڤ تیفانه دیْ ڤه كیْشیت .. دیمیْ وی سوربو ورهیت حه فكاوی ستویر بون سه ریْ خو شكه فتیْ ده رئیخت و تفكر . له شیْت وانیْت شین بوین ژ سه رمادا لیْ تشته كیْ هشک ئه ملیه ئاگر خولیْده ب جار خودكره دیوه كیْ ئه فسانه یی ئه و ئاڤ هه می دكره قورچه ک .. جاری په ر پیْڤه چیْبون و كونج كونج ل نانی دگه ریا ..

- باپیر ئه زیْ برسی مه ..

هه ر وه كی هه ست پیْ دكر كو ئیْدی نابیْنیته ڤه .. هه ردو دانه به رسینكیْت خو وتژی هناڤیْت خو بیْنما كر .. ژهه می ره خیْت ئه سمان گرگرا برو یسی بایه .. نان .. هشكاتی .. گه رم .. هون ل كیڤه نه .. باوره ئه دكر كو پرته كا نانی یا ل سه ر روییْ ڤر ئه ردی مای .. بیْ بچوک ژكه ل گری .. بوپرپرا كوتره كیْ ژكوژیْت شكه فتیْ ده ركه ت .. سه ریْت خو بلند كرن چاڤیْت وان ڤیْكه ئبی .. ل ئیفانیْ كوتریْ په ریْت خو لیْكدان و ده ركه ت لوبرینا گورگا ژنیزیک هات .. دنیا تاری بو نیزیک تر لیهات .. ژینیْ پیاكرنه قیژی .. خو تیْک وه ركرن .. بلند فرین .. چونه ئیْک ب له قا .. شاخ پیْڤه هاتن .. .. چونه ئیْک ب قوچا .. نرینه ناڤ چاڤیْت ئیْک

كوزبون .. وه ستیان .... رونشتن .. كرنه كه نی ..

كه نیه كیْ بلند .. بلند .. ل وارا ده نگ ڤه دا .. كه تن ئه ردی .. گیْژبون ..دریْژبون .. تشته كیْ گه رم ڤ به ر رانیْت واندا چوخاریْ .. كرنه گری ..گری .. گری .. گری .. گری .. گری .. گرن دخه وچون .. نان دیتن .. باپیریْ خو دیتن .. روناهی یێت سوروكه سک وزه ر دیتن .. گورگ دیتن.. كوتر دیتن .. دنیا مه نگک و بیْ ده نگ بو وه كی ئاڤا ژناستی گرتی .. ل شه قا شه قا په ریْت كوتریْ هشیاربون ژ روناهی یا ئاڤیْ ئه دشیان چاڤیْت خو ڤه كه ن .. له شیْت وانیْت حه زن جلكیْت وانیْت بچویک دراندبون .. سه ر خو بلذكرن چاڤیْت وان ب كوتریْ كه تن نایه كیْ كه سكیْ به روییْ دد میْ خوگرتبو ..

# کورته چیرۆک :

# خۆ تافیر کرن

## فاضل عمر

زارۆکه ک ده هسالی گازی دکر : دهۆک ، دهۆک .. دهۆک دو نه فه ر. هـــه که ر چی ئه ز پشتراست بوم کو ئه ز ب وێ ترمبیلێ نــاچم ، لــێ ئه ز وه ک هـــه ر رێفنگه کێ بفێت سواربت ، چۆمه به ر ده ری و مـن لێ نیـری . دو کـرسیـک ڤالا بون ، لێ هه ردو ب دلێ من نـه بـون یـه ک شـکه ستـی بـو و یا دی ژنه‌ک قـه لـه و ل کورسیکا ل ره خ روو نشت بـو نیـڤه ک یـا ڤـالا ژی ڤـه گـرت بـو. ئـه ڤ ژ ئاکه کیڤه . ، ژ ئالێ دیڤه ئه ز نه ب له ز بوم ، له و ئه ز مامه ل هێڤیا ترمبێلا دی .

پیره مێره ک هه فتێ- هه شتێ سالی ل ره خ من سواربو ، شه لواله ک دپێ ی بو، دو قه میس و بلوزه ک دبه ربون ، ئێله که ک دبن شه پکێدا و چاکیته یه ک تاڤێ ره نگێ وی بری دسه ردا ل بـه ربـو ، بـه نده ک کاغـزێن پـێچای دده ست دابون ، نایلۆنه ک شێن تێ ئالاندبو و به نـکـه ک بـاش لـێ گرێ دابو . دورسیێ جاران هوور هوور ل من نیری ، به ری بێژت :

– ئه رێ بابکۆ تو به رێ خوه نادی یه ڤـان پـه رومـه ران . ئه ڤـه ده هه روژه ئه ز پێڤه و خلاس نابن .. هه رێنک دێ خیچه کێ لێ که ت و من هـنێرن نـک یێ دی .

من ژی گۆتێ : مام سۆفی بۆچی به رێ خوه نادمێ !؟

و هێدی هێدی گرێهشکێن به نک ڤه کرن . من ژی بۆ ترانه گۆتێ : مـام سـۆفی د ته دا ره ڤـن ته هۆ هشک گرێ داین ؟ لێ ئه ل من نێری ئه ژی بـه رسڤا دا . به نک و نایلۆن کرنه د کۆشا خوه دا و په ر دانه ڤ من .

– سه ر خێرێ بت باپیر ، وا دیاره دێ چی یه حه جێ .

– خودێ ته بهێلت ، مه گۆت ؛ دێ چینه مالا خودێ و گونه هێن خوه دشه‌یتانی

وه ركه ين .

پيشتى من خواندين ، من وه ر پينچانه ڤه و لىْ زڤراندن .من جهىْ خوه خوه ش كر ، پيره مێرى جاره كا دى په ر نايلۆن كرن و گرىْ هشك به كو يه كو لێداڤه و جهىْ خوه خوه ش كر .

سالان روىى وى د خه و هێلابو ده ما بىْ ده نگ بوىى من هزركر نڤستى يه لىْ وه نه بو ، مه ژىْ وى بىْ ى وى ل كاربو . سه رهاتى و بيرانينێن كه ڤن ، هه مى ، ببون كاسيته كا دووردرێژ و مه شتوخىْ وى ببو ڤيديو وگێله شۆكا سالان وه كى شلخا مێشان لىْ هات بو ... نه ڤه هه مى ل سه ره كى و ل سه رىْ دى كالۆىْ دزانى نه ب مرنىْ بت نه ڤ شلخا سالان به لا خوه ژێڤه ناكه .

هنده‌ك ديه ن و نه ماشه ، هه روژ ، دووباره و سێباره دبون ، مرىْ خوه لىْ نه خوه ش دكر ، لىْ دحه يتاند لىْ وژدانا وى ئێك ل دوو يىْ دى نيشا دكر . ل دوماهيێ چو رىْ نه ديتن كو وژداناخوه پىْ بنڤينت ژ حه جىْ پێڤه . ديسا پرسياره ك هلاويستى د مه ژىْ وى دا هه بو : ئه رىْ چما ده ما تۆلاز و خۆرت شانازى ب ڤان وێنه و ديه نان دبر و نهۆ ، پشتى ژ هێزكه ڤتى دلىْ وى دئێشينن ؟!

چاڤێن وى چونه سه رێك ، كه ڤنه وێنه وه كى ستێران رشتن .چه تۆ هاته بيرىْ ، رىْ گرتن ، كوشتن ، شه لاندن ناموسى شكاندن ..... به س ل ( گه لى يىْ كواشىْ ) ب كێماتى ، سه د كه س شه لاندنه و كوشتنه . يه كو يه كو دهاتن به ر چاڤان ؛ روژا سانج ئيسنايه خوه و رێڤنگه ك ره به ن ژدل پێڤه شه پلى و ڤێباى چاره كه ت. من لىْ نێرى هه ردو چاڤێن وى زيف بون ، روىىْ وى ته نگرىْ كه ڤتنىْ هێنگىْ ژنشكێڤه ب هه ردو ده ستان ستۆيىْ رێڤنگى دگرت و نه دبه ردا تاكو ته زاندى ... ب دو چاڤێن زيف و شه رمزار ل من نێرى ، گومان دكر كو نه ز هزرێن وى ددزم يان ژى دترسا نه ز دزانم چ دهزرا وى دايه .

چاڤىْ وى يىْ راستىْ نڤا و سه رهاتى.يه ك دى كه ڤته په ردا مه ژىْ وى ؛ ئه و ئو له زگێن لسه رىْ (( چه له به شى)) روونشت بون و رێبواره ك ب هێسترا خوه ڤه كه ڤتنه (( گه لى دوبانكى )) تێره ك تژى ل هێسترىْ بو ، دو سه لك تێكدا لسه ر بارى شداندى بون . و گزتنا وى ژ كووراتى يا ده مى زرنگێنى ئێخسته گوهێن وى ؛

– تو دبينى له زگێن ، ئه ڤى بىْ وه غه رى ترى بره ده شتىْ دا ب گه نم و زڤرى هزرا وى دىْ ژنك كه ته نان و سه وكه ، دىْ لبه ر ئاگرىْ سباتىْ خون ! به س ئه ز بابىْ سلۆمه ، نا هێلم ئه و دينده‌كه كىْ ژىْ بخوت . و ده ما مژوولا نگێن وى

له رزین ، هینگیٚ ستیٚرکا خوه ل ریٚبواری دگرته و گولله ل مه شتوٚخسیٚ سـه ری ددا . ده ما گه هشتینه سه ر ته رمی ، هیٚستـرا وی لناڤ تـه ڕاشا دچـه ری ، و تشته ک هه ژی شه لاندنیٚ نه ڤیٚ بو نه ژی دبه ریو .

جهیٚ خوه خوه شکره ڤه و چاڤیٚـن خوه نـڤاندن . من هزرکر دیٚ ب داریٚ زوٚریٚ ده رگه هیٚ مـه ژیٚ خوه گرت . لیٚ من هند دیت ئاخینه ک هاتیٚ و ژنا شاهـوٚیێ گاڤان هاته بیریٚ ، هندی هاتـه خـوه کـو ویٚ سه رهاتی یـیٚ بـپه چنت ئو ژمه ژی خوٚه بشوٚت ، لیٚ نه شیـیا .. سیٚ چارجاران ل من نیٚری ، دلی وی ب گومان بو ، هزر دکر ئه ز هزریٚن وی دخوونم .گه له ک پیڤه چوٚ ریٚڤنگه ک و ژنا وی هاتنه بیریٚ ، دیسا دڤییا هوورهوورکیٚن چیروٚکیٚ ژ مـه ژیٚ خوه بشوٚت ، لـیٚ نه کاری . من لیٚ نیٚـتری و ئـه و ل مـن ، چاڤـیٚن مه پیٚک که ڤتن ، لیٚ وه کی کچه کا شه رمین سه ریٚ خوه شوٚر و ده ست کره په ڕیٚـن خوه ، بوٚ خوه گوٚت ؛ ئفف په ڕانه ده سپیٚکا خوه تافیر کرنیٚنه .

بـه ری بچته حه جیٚ ، ژ گونه هان تیٚ شووشتن ، هه چوه کو ژ دایک بوبه ڤه .

من سـه ریٚ خـوه خوارکره سه ر ملیٚ خوه ، ب تی یێ چاڤی لیٚ ن ێری ... زانی ئه ز باوهر ناکه م .

تیٚبینی :

١- خو تافیرکرن = التطهیر النفسي ، تطهیر الذات .

٢- گه لی یێ کواشیٚ : گه لی یه ک چیاییٚ بیٚخیٚره ل ده شتا دوبانیٚ .

٣- چه له به ش : کومته ک ل هنداڤ گه لی دوبانکی ل چیاییٚ بیٚخیٚر .

٤- گه لی دوبانک : گه لی یه ک چیاییٚ بیٚخیٚره ، دکه ڤته راستا گوندیٚ دوبـانکیٚ ل ئالیٚ ده شتا دوبانیٚ .

# (( په یژه ))

## ئیسماعیل ڕوژبه یانی

شمشێری کات شه وگاری له ناڕاسته وه دوو له ت کرد بوو که چی من تازه خه م و په ژاره بیبوه گه واڵه هه وره‌کی چڵکن و هه ڕه شه ی شیلۆ کردنی کازیوه ی شادی لێده کردم . بویه پرسیارێک له مێشکم بروسکه ی دا .. منیش یه کسه ر ئاراسته ی که سه وه ی ناوه وه م کرد .

-تۆ بلێی بتوانی هه ڕه شه که ی بخاته چوارچێوه ی کرداره وه ؟

-له کاتێک دا یوی ده کرێت ده ست به چاوی خۆ ته وه بگریت و هه نگاوی کوێرانه بها ویت . دوایی

تۆ یه کی قاڵ بووی به لکو له دایک بووی نێو هه وره

تریشقه تیسکی هه تاو و گڕه ی .. گه رمیان په ی چی له دڵه ڕاوکێیه کی وه ساداگێنگڵه ده که یت ؟!

- ئه ی چاره ؟

-له قسه کاتم باش ورد بیبیته وه چاره ت ده ست ده که وێت . خه ریکی ڕێک خستنی وشه کانی بووم ئه وه نده م زانی ژنه که م شوێنه که ی به جێ هێشت و هات به ته نیشتمه وه ڕاوه ستاو به قامکه ناسک و دلڕفێنه کانی ده ستی کرد به شانه کردنی پرچه که م . نه خێر کشته کی ڕسته که ی پێ بچرپم :

-ئه وه له چی بیر ده که یته وه ؟ .

-له و شته ی وائێواره باسمان لێوه ده کرد .

-تۆی ئه وه نده له شت ده کوڵیته وه .

-ده مه وێت چاره سه رێکی بۆ بدوزمه وه .

-جارێ واز له وه بهێنه . ده زانی حاجی برات دیسانه وه که وتووه .

-ئینجا ئه و که ی ساغی و نه خوشی دیاره !

-ئه لێم چراكه بكوژێنمه وه ؟
-ئاره زووی خۆته .دوای ئه وه ی به جێ ی هێشتمه وه له گه ڵ خۆم دا كه وتمه قسه
كردن :
-به یانی زوو بچم بۆلای حاجی پاش برینك دانیشتن شته كه ی بۆ ده گیڕمه وه
بزانم ئه و چۆتی بۆ ده چێت . كۆمه ڵه وشه یه كی كه سك و بریقه دار پاڵێ به وانه
ی پێشی خۆیه وه نا :
-چاك بۆی چووی خۆت ده زانی حاجی زۆر شاره زایه .. هه واڵێ كێت ده وێت بڕۆ
لای دانیشه و ده م ودووی بكه ره وه . بست به بستی هه موو ناوچه كانی ئه م گه
رمیانه ی .. دوو گاسنه كردووه . بڵێ فلانه كه س یه سه رحه وت پشتیت بۆ هه ڵده
دات . مێژووی هه موو گه رمیانی ئاخنیوه ته نێو ده نكه كانی ته زبیحه ئه بڵه قه كه
یه وه . له بیرته جاره كه لێت پرسی :
«حاجی بزانم ته زبیحه كه ت له سه دو یه ك تێپه ڕیوه ؟ » ئه و له وه لام گوتی :
(-له گه ڵ هه موو ڕووداوێك دا ده نكێكی بۆ زیاد ده كه م .
(-له وانه یه پاشكۆی بۆ دابنێی ؟)
(-ده م خۆش خۆمیش هه مان بیرم لێ كردۆته وه )

-٢-

حاجی ئیفلیج ئاسا خۆی جه سپ كردبوو به ئه سكه مبیلێكه وه و له سه ر یه كه
مژی له جگه ره كه ی ده ستی ده دا . وه كو چاوی پێ كه وتم به ده نگێكی پڕ
له گله ییه وه گوتی :
-باش بوو هاتی .
-چی خێرته ؟
-ئه وه تا ده مبینی .
به ته نیشتیه وه ڕوو به ڕووی وێستگه ی ئۆتۆمبیله كان دانیشتم . ژاوه ژاوی بازاری
سه وزه فرۆشه كان ته نگی به گفت و گۆكه مان هه ڵچنی بوو . له ناكاو بایه كی
توند هه ڵی كرد ده گك و زه ڵه كه ی پێچ داو به ره و ڕوۆژ ئاوای شاره كه ی به
ڕێ خست . ده رفه تیشی بۆ وڵاكردنه وه ی پرسیاره كه ی من ڕه خساند . ئه وه
بوو ئه و گوتی:

- ئه مه ی توش هه مان گرفته که ی (حه مه ی وه ستازوزراب ) ○ .
- باشه ئه و چی کرد ؟
- کاکه په یزه یه کی زوز دریژ په یدابکه پێی دا سه رکه وه و ئامبازی گه واله که ببه ره وه .
-حاجی واپێده چێت تیزت به ئه قلم دێ ؟
- نه به خوا به راستمه .
-تۆ پێت نه گوتم ( حه مه ی وه ستازوزراب ) چۆن چاره سه ری بۆ گرفته که ی دۆزییه وه ؟
- له ئامباز بوونه وه به ولاوه ده بێت چی جۆره چاره سه رێک هه بێت !؟
- باشه (حه مه ) که ی واپیاو بووه ؟ !
-تۆ نازانی ئه و ئاوێکی مه نگک بوو .
- ئه مجا کی ده لێ گرفته کانمان هاو تۆخمن .
- هه رچونێک بێ مرۆ ئه گه ر به بیرو باوه ڕێکی پۆلاینه وه نه چێته مه یدانی ژیانه وه ئه وه له و کانه دا ناتوانێت زال بێ به سه ر هیچ ته نگک و چه له مه یه کی دا .
- خۆمیش هه مان بۆچوونم هه یه له م باره یه وه
- که وابوو برۆ به دوای په یژه یه ک دا بگه ڕێ .
- گه ڕانی ناوێت خۆم له ماڵه وه درووستی ده که م

ئیسماعیل رۆژبه یانی

# دوا سکالاً

## چیرۆکێکی شانۆیی خۆماڵی یه له چوار دیمه ن دا
## باسی سه رده می دوادوای پاشایه تی ده گێڕێته وه

عبد الرزاق بیمار

### دیمه نی یه که م :

ژووری چایخانه یه کی گه وره دێ یه ک ، ته خت و میزی کۆن و دیواره کانی له وێنه ی کاربه ده ستانی شۆرشی قه مووزی ۱۹۵۸ و وێنه ی ئه ستێرانی سینه ماو دیمه نی سروشت سواخ دراوه . )

چایچی : ( له ناوه ڕاستی شانۆدا وه ستاوه ، ده ستی ناوه ته ناوقه د ی ئه ستووری، به شێوه یه کی کۆمیدییانه چاوو برۆ له مرادکه هه ڵ ده ته کێنێ ) :

قسه و قسه لۆکی پێ ناوێ .. نه که س بلێ حق ، بلێ نق .. وا ده وری کۆماری هات . ( لاسایی خوتبه خوێنه کان ده کاته وه ) وا شه وی تاریکمان بوو به ڕۆژی ڕووناک . قه هره مانه کان ئیشی خۆیان زۆر چاک ده زانن .

مراد : ( که پاڵی دابووه وه . هه ستا ئه ی که ده زانن چۆن ده بێ ....

چایچی : هه ر له سه ر خوتبه که ی خۆی ده ڕوا . ده ستی به سمێڵی داده هێنێ )

زۆرداری نامێنێ که س نا توانێ له مه و لا ئه نگوست به خراپه بۆ که س درێژ بکات . دنیا ئازادی یه .

مراد : ئه ی که قاره مانه کان وا ده زانن چۆن ده بێ غه دره له من بکرێت ؟ له ئازادی و شه عب دا چۆن زه وی من که به فرمێسکی چاو و به عاره قی ناوچه وان له و هه ڵدێر و شاخ و داخه کردمان به و زه وی یه .. چۆن ده بێ لێم دا گیربکرێ ؟ ها ؟ ده ی ده وه لامی ئه وه م بده وه .. ده با بزانم .

چایچی : ئاهه . هاتینه وه سه ر مه سه له ی یا سینی گولکێ کوڕه ئه وه ی چوو چوو ! ئه وه ده ستکردی سه رده ی گۆڕ به گۆڕ بوو ، شۆرشی به غدا هه قی به سه ر ئه و شتا نه دا نی یه . گوایا شۆرش هیچ ئیشێکی نی یه ئه وه نه بێ بێت فایلی کۆنی تۆز لێ نیشتووی سه د ساڵان ده ر بهێنێ و کۆن نوێ بکاته وه ؟

مراد : ئه دي شوڕش ماناى چى يه ؟
چاپچى : شێته شوڕش ماناى شه عبه و ئازادى يه . دژى ئیستیعماره و هیچى دى نا .
مراد : ئێ .. هه ! ده زانم ئیستیعماره . خۆ كاعه لى ئیستیعماره .
چاپچى : هه ى به لاقى خێوى يه وه
مراد : يا به لاقى خێوى يه وه بێ . شوڕش ده بێ هه قم بستێنێ
چاپچى : هه ق هه قى چیته ؟
مراد : ئنجا بۆچى هه ق نى يه ؟ زه ويى هى من نى يه ؟ ئه ى ئى كێ يه ؟
چاپچى : خوا سه لامه تت كا مام مراد . وازبینه ، شه وو رۆژ بیستو چوار سه عاته ، حه زده كه ى بیستوسێ سه عات و نیـوو ٢٤ تانیه ى هه ر بۆ باسى زه وى يه كه ى خۆت ته رخان بكه يت .
مراد : ( به توو ره يى يه وه واربینم ! ؟ وه ى سه لاّ له ئه قلى خۆت و ئاغه ت . وارده بنم . وانى يه ؟ وه لّلا هه تا ئه م چاوه ى من بترووسكێ و هه تا ئه م رمبانه م بگه رێ و هێزى شەن و بازووم هه بێ هه ر به دواى ده كه وم . سكالاّى خومى پێ ده ده م . هه ى له منت نه كه وێ ئه من له زه مانى گوڕ به گوڕه كه وازم نه هێنا ئنجا له زه مانى ئازادى و شه عب دا دازى لێ بینم ؟ !
چاپچى : ( له بن سمیلّى يه وه پێ ده كه نێ ) .هه تا كه ى هه ر خۆت بێ ئه قل ده كه يت . مالّ خراپ ؟ ده كه ى رۆژێك منداله ووردكه ت به دوو بكه وێ ، عاله م چه پلّه ت بولّێ بده ن :
خالّ مرادى شێت و پت
دیسسان به ره و شار ده چێت .
مراد : وه ى ئه وانه ى وا ئاكه ن !! له گه لّ تۆ ئاماقـوولـبان كرد . ئـه تـۆ بێ عه قلى . ئه من كه م عه قلّ نیم ! ئه وه ى چه پلّه بۆ من ده كوتێ ئه وه له كینه ى من ئاووسه . ئا .. ها .. ئا بێ ئه قلّم . كوره جه نا بى جه ناباى ئه ت زانیوه ؟ ها ؟ تۆ بێ ئه قلّى .
چاپچى : به چى ده زانى ؟
مراد : به سمێلّه كانـت . لـه كـنه خۆت وایـه زۆر نـێ گه يشـتووى و له هه موو شتیك بوو يه وه بۆه سمێلّت لێ به رداوه ته وه .
چاپچى : هه نگاوێك لێى دێته پێشێ . به پێنه نینتكي ئاديارە وه كوڕه . مراده شێت.

خوت شێت مه که !

مراد : جا بوچی شێت ده بم ؟ بوچی ما بـاوکی نـاو قـه بریـشت نازانی‌ ئـه و زه ویانه نی ئێمه ن ؟ به ده ستی خـو مان و به ره نجی شانـی ره م نجیبه ران له قه د چیا ده رمان نه هێناون ؟ ئیستاش کا عه لی تـه لاری لـه نـاو دروست بکاو نه شوێرم به لا یه وه بچم ؟

چاپچی : ئاخر مراده شێت . ئیستا که سمان لاتی یه .. بـه لام ئـاخر پێم نالێـی چیـت پـێ ده کرێ ؟ ئه گه ر شتێـکت پـێ کرا با ئـه وده م ده ت کرد .. زه مانی خوی . ( ناوێک ) شایه د شایه دی داوه و ده لێـن هـه موو شتێک پراوه ته وه .. ئه دی مه حکه مه وه ختی خوی بریاری نه داوه ؟

مراد : با . ئه مما خوت نازانی شـایه ده کان هـه مـوو دروزن بـوون ؟ ئه ی له ژووری حاکم ده ستم له چاو رانه کردن ؟ جنـێوم پـی نـه‌دان ؟ ده مزانی کێ شایه دی بو ده دا . ده زانم مـه سـه لـه چی یـه . ئه توشی بانـگ بـکردبا هه ر چه ند فر ئاگاداریش نی . وه ختی خوی ده ستت به قورعانێ داده دا

چاپچی : ( زیاتر لێ ده چیته پێشه وه . ده ی خافلێنێ من ؟ . من .. مرادکه؟

مراد : ئه رێ وه للا تو .. تو .. ده نـا ئیستـا هـه ق وایه قسه ت لـه گه لێ من وابێ ؟ مه ی فه رموو زه وی و باخه که می بده یه . یا عافیتی کاعه لی بێت.

چاپچی : ( به دوو ده ستی زل مراد له شانی یه وه ده گوشێ و ده ی هه ژێنی و وه کو بووکه شووشه هه لگێرو داگێری ده کات . ) ها . ها .ها . ده رونـش سمایل برای وه کو توی هه یه ! ئه ی له و وه جاخه ێ !

## (٢)

هه ر ریه نی چاپخانه که یه ، به لام کات و رووناکی گوراون . )

مراد : مه سه له چی یه ؟ مه سه له ئـه ویـه وه کو من تێی گه یشتووم ئه م خه لکه له شورش نه گه یشتوون ! شه عب و ئازادی مانـای چی ؟ ئه گه ر نان و زه ی و سه ربه رزمي ئێمه ی تێ دا نه بێت ؟

کاکه دنیا گورا .. بابه به بیللا دنیا گورا ! کوێرینه باب و باپیرانـی ئێـمه نابینا بوون هه رچه نده تووڕهش بێن . هه موو ئه م تـالاوی یـه ی ئیسـتا بـه گه رووماني داده که ین هه موو ئی زه مانی پێشووه . ئه وان وایان لێ کردین . ئای ئه گه ر وه ختی خوی نیوه ی ئه وه ی ئیستام ده زانی ئای هه یش !

دانیشتوو (۱) : ئه گه ر پشت زاتیبا . فایده ی چی ده کرد ؟

مراد : ئه گه ر بۆ که س سووری نه بوایه ، من ده مزانی چیم ده کرد . ده نا به قورعانه کی عه زیم ئه و دارانه ی له هه لـد یـری گردی چـه قیـون و ئیسـتا هه مووی زیڕ ده رده ده ن ئه وده م هه مووم ده کردنه زه رگک له که لـه کـه ی عه لی یه قووچم راده کردن هه ر به سه ر چه لیم ده کرد . کاکیـنـه . بـه و قورعان و به و خوایه ی ئیوه بڕواتان پیی هه یه ، ناو له پی ده ستـم چه نـد مووی پینوه یه ئه م گرده ش هه ر ئه وه نده داره ی لی بوو . ئیمه ره نجمان دا. ئه و مالی کاول کردین .

دانیشتوو (۱) : کا حوسین ، خۆ جاران خالۆ مراد زۆر دۆستی مالی ئاغه بوو .. هه ر له دیوه خانه بوو .

مراد : ئاخر ئه و وه خت دوور له تۆ بی ئه قل بووم .

ئاغه به خوی له دووی ده ناردم . رووی تیی ده کردم :

ده ی مراد دوو قسه ی قوڵه و خۆشمان بۆ بکه .

منیش پیم ده یگوت : ئنجا .. ئاغه .. قسه ی من ده بی چی بی ؟ ..

نا .. ده یگوت .. خۆشه .

دانیشتوو (۲) : تۆ بلیی خالۆ مراد دیواخانه که ی بۆ جوش بدا ؟ نـاوه لـلا بـۆی ده رووخینی .

چایچی : هه ی ده م خۆش .

مراد : ئه گه ر به ده ست من بی هه زار مـالی هه بی هـه ر هـه زاری پیی چوڵ ده که م . چونکه ئیمه به براگه وره مان ده زانی و به تایبه تی من .. خۆم له پیناوی ئه ودا به قوربان ده کرد ! تا کۆستی خستم .. پشتی شکانـدم . ته ماع به رچاوی گرات .. ته سویه ی زه وی وزار په یداتوو به جاری ئیمه ی بی به ش کرد . [قاله ی کوری برازای مراد دیته لای ]

چایچی : مراد هه سته ده ی وا بانگت ده که ن له مالی . ئه مرۆ زۆرت جوش دا ، سه ماوه ره که هه لده چی . [ده ست بۆ سه ری خوی ده بات نیشانه ی مینشک تیک چوون پیشان ده دات . ] ده ی برا ده ی .

مراد : قاله که .. وه ره .. بابه . دانیشه [له ته نیشی داده نیشی ] ئه ری چایه کی ناخویه وه ؟

قاله : نا .. بابه گه وره . دایکم گوتی بیته وه .

مراد : ئیسنا دیمه وه . قسه کان خوشن . ئیستاو ده میکی دی رادیوکه کوردی قه ده کا .. ئه مجا گوێمان له شورش ده بێت .. کوره که ی خوم . [ له و قاته دا ، چاکه ت و پانتوڵ له به رنگ دینه ژوور ] داخوا ئه مه کێ بێت ؟
ئه فه ندی : سه لاموعه لێک
چایچی : عه لیکوم سه لام . فه رموون دانیشن .
[ کابرا داده نیشێ و خه لکه که یه که یه که به خێرهاتنی ده که ن ، ئه ویش وه لامیان ده داته وه . ] و ابزانم له هه ولێره وه هاتوون .
ئه فه ندی : به لێ .
دانیشتوو (۱) : هه ر به خێربێن .. خێره هاتووی ؟
ئه فه ندی : ئینشاللا خێره ، خوت نازانی مووچه خوري حکومه ت به دوای ئیشی ئه م خه لکه دا ده که وێت .
دانیشتوو (۱) : به لێ راست ده فه رمووی ، ئه که ر بو ئیش نه بێت نه ده هاتنه ئێره. به لام ده لێی مه ئمووری مێش کوژی ؟ .. یان .. نا .. ناونووسی ؟
ئه فه ندی : نا ..
مراد : تو چووزانی ! به فیکری من دختوری مه ڕو مالاته .
ئه فه ندي : (پێ ده که نی ).. بوچی سه روسه کوتم له حه مه بوری باش دختوره که ی به یتالخانه ده چێ ؟
دانیشتوو (۱) : نا جه ناب .. ئیمه حه مه بوره فه ندی وره زا فه ندی ده ناسین .. نا ئه و نیت .
ئه فه ندي : به لام هه روه کو بلێی چاوه ڕوانی مه ئموورێکی حکوومه ت بن بویه پرسیارده که ن . ( تاویک ) برانیه . من له گه ل حاکم هاتووم .. بو که شفی مه حکه مه .
مراد : [ ره نگی تێک ده چێ . ده شێوێ ] حاکم ؟ مه حکه مه ؟ بوچی ؟ هه ی مراد به قوربانت بێت .
ئه فه ندی : که شفه .. وه کو بلێی پشکنینی پێش دادگایه .
مراد : ئێ هه . ئه م جاره ش مه حکه مه ! ؟ [ هه ل ده ستیته سه ر پێ . به ده نگێکی به رزو ده ست راوه شاندنه وه ] دیسان مه حکه مه ؟ ئه م جاره یان کوشتنم یان باخه که ی گردی خه ج . یا کوشتنی حاکم و مه حکه مه .. یان باخه که ی گرده خه ج .

دانیشتوو یه ک : ده تۆ دانیشه . مراد . هه ی سه لامه ت بی چی بووه و چی رووي داوه ؟
مراد : نا .. نا .. ئه مه دواجاره و ئه م له جومهووری و له شورش و له شه عبی دایه. چی دی خوم بی ناگیرێت یان زه وی یه که م .. یان مردنم .
چاپچی : یان خو شێت کردن .
مراد : ئای .. هه یش [ به ددانی به ده ستی خوی داده نووسی دیسان بـه قسه ده م کوژیت ؟ هه ستم چاخانه که ت لی ویران بکه م ؟
قاله : ( ده کری ) بابه گه وره . (خوی لی نزیک ده کاته وه ) .
مراد : ( له خوی دا ده پچری .) هیچم نایه ته به رچاو ( هاوارده کا ) من بی مالی . بی گیانی ، هه ژاری .. ئیدی به سه . ئنجا نوره ی منه . ئـاخ چـون ئیمه یان کوشت . شه رت بی به ده ردیکی بیه م تا ماوه نانی ئارام نه خوا .
دانیشتوویه ک خوا سه لامه تت کا . شاده یه کي به هه ق بینه ، پینی ناوی بشیونیت ؟
مراد : ئاخر . دیسان مه حکه مه ؟ کوربنه هه ر ناوی ئه و ده عبایه بی ئیـمانم له قه لبی نامینیت .
چاپچی : ده برو بزانه . دایکی قادر چی ده وی . ده برو . با ئه م به زمه ش بـه س بیت.
مراد : ( هه ر له سه ر قسه ی خوی ده روات ) دیسان مه حکه مه ؟ هه ر پـاره و پوولیکی هه م بوو هه مووم دا به مه حکه مه . ئیستاش به زگی رووته وه هه ر مه حکه مه ؟ ( به گریانه وه ده که ویته زه وی ) .
ئه فه ندی : ( له که ل یه ک دوانیک بوی ده چی هه لی گرنته وه ) هه سته . کاکی خوم . ئیمه بو ئه وه نه هاتووین .
مراد : راست ده بیته وه . دیه نیـکی تـه مومـژاوی کـه وا چانـچانـه که و دانیشتوان ده رناکه ون )
زه ویی گرده خه ج ئالتوون
ده پژی زه ویی گرده خه ج مراد ده کوژی
ده نگیک : مرادکه ! کی دادت ده پرسی ؟
ده نگیک : مرادکه ! هو مراد !! که کاکتیان کوشت لـه کوی بـووی ؟ ( مراد هـه ل ده په ری و به پی له زه وی ده داو هاوارده کات . ده که وی )
ده نگیک : مراده شیت

چی دی به ره و شاری ناچێت
ئه و چاره شار بۆ لای وی دێت.
مراد : ( هه لْ د ه ستێ . باش گوێ ده گرێ ) ده ئه وه بلێ . به لێ ئـه م جاره شار بۆ لای مراد دێ . ئه و جاره جونبوری دێته لامان و سکالاکانم ته ماشاده کات . هیچی دی سکالانامه نانووسم . وا شار به ده نگمه وه هات .
[ دیه نه که ی چاخانه که روون ده بێته وه . وه کو جاران ] دانیشتوویه ک : کوریشه . من ناهه قی ناگرم . ( چایچی و کچه برازاکه ی مراد دینه ژوور )
ژنه : وه ی مامه رۆ ! هه ردووک چاوانم کوێر بن . ده ک بمردبام وام نه دیتبای .
دانیشتوویه ک : ده کچی خوێم له گه لْ خوتی ببه وه با تاوێک بحه سێنه وه .
ژنه : ده هه سته .. خوت فه وتاند ، ئیمه شت به خه مانه وه کوشت .
چایچی : راوهسته. هه لی گرین .. له خوێچووه . ( ژنـه ئـاوده هـێنی ده موچاوی یێ ده رشێنێ .)
ژنه : تای خوای بێ باک . وه ی مامه گیان . ده هه سته وه ره پشتم . ( مـراد چاوی هه لْ ده هێنێ )
دانیشتوویه ک : راوه سته ئیمه شانی ده گرین و ده ی هێنین . تۆ برۆ .
قاله : تای مامه رۆ ! ( ده پیه نه ده ره وه ) . ( خه لکه که داده نیشته وه )
ئه فه ندی : خۆ من چیم نه گوت ؟ .
چایچی : نه خێر ، نه خێر . تۆ چی بکه یت . به لام ئه م پیاوه ته می مه حکه مه ی له که لله دایه . تاوی مه حکه مه بێت ده مار ده یگرێ .
دانیشتوو : ده مار ؟
ئه فه ندی : ده مار ؟ شێته ؟
دانیشتوویه ک : ناتوانین بلْێین شێته . مه لام ژیریش نی یه . وا نه بوو . به لام وای لێ هات .
دانیشتوویه کی دی : مه سه له دووروو درێژه .
چایچی : چه ند نه سیحه تی ده که م ، فایده ی نی یه ، باسی بۆ ده که م .جمهوریه ت و ئه وه ی رادیۆ ده یلێ . دلی خوش ده که م .. رادیو ئه وه ندن ی هیوا له دلی کردووه جێی نه بێته وه . پێی ده لێم باوکی خـوم دونیا گـوزراوه . هه موو شت چاک ده بێت و چاکیش به ئیمه ده گات . به لام ناو لیی تێک ده چێ .
کابرایه : زوّر ده ترسم . رۆژێک خـوێ بـه قـه لیه یه ک دا بـدا .. یـان ده ستـێک

بووە شێنێ .

دانیشتوویەک نا . بێ قەزا بیت . نا . مراد مەڕی خوایە .

سۆفی : مراد وەلی یە وەلی . زمانی دڵ و زمانی زاری یەکە .

ئەفەندی : حاڵی چۆنە .

دانیشتوویەک : بێ کەس ، بێ ماڵ ، کەسی نی یە . تاقە کچێکی برای نەبێت .

سۆمی : خوای هەیە . خوا .

چایچی : ئەوەی هەیەتی هیوایە . دوا سکالای پێش کەش کرووە .

ئەفەندی : رۆژێک دەبێ هەر گوێی لێ بگرن .

دانیشتوو (١) : خەڵک وا چاوی بڕیوەتە هەرای ئەم خوارە ، زۆر شتی ئاڵ و والاو سەوزو سوورمان دیتە پێش چاو کە لێک قسەی خۆش دەبیەین . ئێنجا با بزانین کەی دەگاتە جێ .ئێمە هەر هەنیدە سەرمان لەم دنیایە دەردە چێت.

چایچی : باش دەبێ .. هەر باش دەبێ . [ گوێمان لە غەڵبە غەڵبێک دەبێت لە دەرەوە . ] ئەم دەنگە دەنگە چی یە ؟ دا بزانم ! . [ سەرێ لە دەرێ خواردەکاتەوە . لە پڕ روو بە رووی مراد دەبێت . سەرقوڵت بێ پێلاو . شەرواڵەکەی هەڵ کردووە و خۆی گورج کردووە و لە تەنانێکیو رەقی بە دەستەوە یە . دیتە ژوورەوە )

مراد : زۆر باشە و زۆر باش دەهێنت . دەنا بە هەقی ئەو زادەی کە بەڕێکی لە قورعان زیاترە چوتی بمانە وێ . وا دەبێت .تازە پێ یان گوتم هەر کە لێرە رۆیشتم . بە لێ ئەوە مەحکەمە یە . ئێنجا چی یە . با مەحکەمە بێت . ئیش مەحکەمە . ئەمە نوێنەري شۆرشە . شۆرشیش ئەگەر بۆ ئێمەی نەکا بۆ کێی دەکا؟ ئەم جارە مەحکەمە یە نەک گاڵتە . هەر گوتیان مراد شێت مەیە ، ئەوەندە ئەرزو حاڵە مە نووسە . هەر نووسیم ، بە دوای کەوتم. وازم لێ نەهێنا تا سەری گرت . ئێنجا هەر . یەک دوو سەعاتی دی یە هەمور شتێک .روون دەهێنێتەوە . مەحکەمە بڕیاری تەواوی خۆی دەدا . خزمینە مزگێنییتان بدەمێ .. تاریکی نەما .. ئەوا رۆژ هەلات .. سەبرکەن .. شوورەیی یە هەرچاو لە زەوی دەچەقێنن سەرتان بەرزبکە نەوە و تەماشای ئاسۆی دەم کەل بکەن .

ئەفەندی : باوکم .. وەرە دانیشە . بحە سێوە . بە خوا بابە ئەتۆ شێت نیی . تۆ گە لیک - ئەگەر شێتیش بی - گە لێک لە و ژیرە رزیوو بە دکارانە

ئێسک سووک و ماقوولتری . ده دانیشه .. حه ز ده که م قوت قوت به و راوێژه خۆشه ت چیرۆکی خوتم بۆ بگێڕی یه وه . ده با له بنج و بناوانی مه سه له که تێ بگه م ..

چاپچی : من بۆت باس ده که م .

مراد : نا ئه تۆ نایزانی . کاکی ذه فه ندی ده ردی من گرانه . باری من ئه وه نده قورسه .. ئه ها ده لێی ئه و چیا شینه یه له سه ر سه رم راوه ستاوه ، هه ردا دام ده پهستێ و ده یه وێ به ئه رزي خارام دا بیاته خوارێ و نقوومم بکات ، به لام من سه ری خۆم له بۆ ڕاده گرم ، نــاونـاویش سه ریزنوي یه کي له بۆ ده که م و سه ری خۆم له کاران ده له قێنم . ذه و ده مه ی من شت ده بینم و ئه وان نایبینن پێم ده لێن : شێت .

ده چوای خۆم گوێت لێ بێ . بزانه شێتم ! ئه وه ی

له شه وێ دا له خه لکی زیاتر چاوه نوڕی رووژ هه لاتن بکات به شێت داده ندرێ.

چاپچی : ده چاویده ئه و دیمه نه سه یرانه .. تا باش خالْ مراد بناسیت :

## دیمه نی دووه م

## ((۱))

کاعه لی خان : کوڕه ده روێش سمایل ئه وه کاره کردووته ؟

ده روێش : قوربان به کارێکی خراپی نازانم . ئه وه ی کردوومانه سوودی گشتی تێ دایه .

کاعه لی : سوودی گشت ؟ کێ یه ؟ گشت منم . ئێوه به بێ ئیمه کێن ؟ ئێوه ده ستوپێن . ئیمه عه رزو ناموستان ده پارێزین ئه گه ر ئێمه نه بین ئێوه نین.

ده روێش : فه رمووده تان له سه ر سه رو له سه ر چاو ، به لاْ پێم نالْێی چی خراپمان کردووه ؟بناوانێکمان هه لْبه ستووه ، ئه و دوڵه بێ خێره که له م لاو ئه ولا وه کو پشتی که ر رووت و له بنه وه میزاوێکی پسێ دا ده ڕوێی و ئه ویه رو ئه م به ر که نده لاْن و گردو هه لْه ت بوو بناوانێکمان لێ هه لْ به ست . ئێستا ئێستا جوگا ئاو له ولاو ئه ولای دوڵه که پێچاوپێچ به ده وری ئه و گردوانه دا

چاوشارکێ ده کات و هه تا ده ڕوی و هه تا دوا دلۆپی ئه وا ده یکه ینه به راوو ڕه زو باغ . پێم پێم نالێی ئاغه ئه وه زه ره ری چی یه ؟
کاعه لی : ناقولییان مه که گالته به قسه که م ده که ی هه ی که م عه قلی هه رچی و په رچی . نه ء . ئایه لم ! ئاوی کانی یه کان نی منه . لێ ئاگه ڕێم په نگاوی بده نه وه و بۆ خوتانی ببه ن ! بۆچی شاری بێ حاکمه هه ر که سێ چی ببه وێ به که یفی خوی بکات ؟
ده روێش : قوربان ئێمه له عاست ئیوه خوزمان به خاوه ن مولک نازانیین . باب و باپیرانمان هه ر له گه لْ باووباپیرانی ئێوه وه ها بوون . خوشیتان خوشیمان و ناخوشیتان ناخوشیمان بووه . ئه وه ی هه مانه خوّ هی ئیستا نی یه .
کاعه لی : ده روێش پێ له ته خته ی چرووک مه نێ .. که پێت لێ نا .. چرووکه چرووک .. قرچه ده کات و ده شکێت . ئه وده م گرمها به رده بی یه وه و لنگه وقورچ هه لْ ده دیرێی به ره و گورستان گلۆرده بی یه وه و خوت پێ ناگیر یته وه .

ده روێش : کاعه لی ، مردن و ژین به ده ست خوایه و هه ر خوی خاوه نی گوڕستانانمو منه تی به نده ی خوای تێ دا نی یه . به لام ، ئاغه ، باپێت پلێم ئه وه بناوانه کراوه ، هه موو شت نه واو بووه .
به کینک : ئیشتاش چونی تو رات له سه ر بێ وا ده که ین .
کاعه لی : چۆن وا ده که ن ؟ ده بابزانم ! ئه من ده مه وێ بگاته زه وی یه کانی منیش .
به کینک ک خو زور دوورن .. نه لام هه ر قه یناکه .. برا گه وره له خێرو خوشی بێ به ش ناکه ین.
کاعه لي : دوور نا دوور . خو وه کو ده روێش ده لێ ئاوان گوێزینه وه . ده شمه وێ ئاویان بگاتێ .
ده روێش : کاعه لی ! ئیشالْلا ده گاتێ . کاعه لی ئه وانه ده بینی ؟ وه لْلا هه موو پیشتیان کوم بووه و تیره قه ی پشتیان قرچه قرچی ده هات له ژێر به ردی گه وره و تووره که خولْ دا .دیواری ئه و بناوانه هه روا به ئاسان هه لْ نه ستاوه . به راستی به ری ره نجی شان و پیلی ئه و خه لکه به سته زمانه یه ، ده با له سایه ی سه ری ئێوه ش دا نانێکی به ره حه تی بخۆین .

کاعه لی : درێژه پێدانی ناوێ ، ئه من پێم گوتن . ده بێ ئاویان بکاتێ . وه ی خواو له حالی ئه گه ر قسه م بشکێنن !

[ ده ڕوا ]

## (( ٢ ))

جوتیار (٢) : گوێت لێ بوو کاک ده روێش چۆن هه ڕه شه ی لێ کردین ؟

ده روێش : کاکم کوڵاکێکی له به رێک نه داوه و ده ستی به خوڵ نه بووه ده یه وێ له سه ر حاڵزی ببێته خاوه ن به ش .

جوتیار (٢) : ئنجا ئه وه چۆن ره وایه ؟

جوتیار (١) : ره واو ناره وا ، دنیا هه ر وابووه .

ده روێش : هه ر وا نا بێ . باشه برانیه .. ئێمه وا بناوانه که مان هه ڵ به ست و کار ئه واو بوو .. ئاوه که زۆر زۆر به شی خۆمان ده کات و ناکات .. ئیبێ چۆن بیگه یه نیته زه وی یه کانی کاکه عه لی که ڕوژه ڕێ یه ک دوو ره ؟

جوتیار (١) : دوورو نادوور ، چاره مان نی یه .

ده روێش : ماناى دایه له به شی خمان دابڕین و بیده ینه ئه و .

جوتیار (١) : ئه مه ش وه کو : پاره دارانه ، دیوه خانه و بێگاری خانوو و هه ره وه ز و ره زبڕین و شتی دی .. ده بێ په یامی که ین . ده نا .. دیسه که مان لێ ده بێته وه خوری .

جوتیار (٣) : ده روێش ! تاقه تی گێره و کێشه مان نی یه .

مراد : هۆ کاک !! ئێمه هه قمان نی یه . کاعه لی چۆن بووێ ئێمه وا ده که ین . کاعه لی له خۆمان ناکه ینه دوژمن .

ده روێش : وس به . ده م ڕووت دوژمنی چی ؟ بی بڕه وه .

جوتیار (٣) : به لێ ، کاک ده روێش ئێ و هه وبره ئاو زۆر ده کێشێ ئێمه له عوزده ی نایه ین .

ده روێش : برایینه ، مادام گوترا ئاوی ده ده ینێ ، ئه وه ده ی ده ینێ به لاَن به ڕیزو به نۆره بێ دادێین هه ر که سه به پێێ جێگه و ، شوێنی به شه ئاوی خۆی بۆ دیارده که ین به مه عده له ت داره به شی ده که ین ئنجا چه ندمان به ر که وت ئه وه نده یه ، زه وی یه کانی کاعه لیش وا داده نێین .

جوتیار (١) : : زۆر باشه

جوتیار (۱) : زۆر باشه ، هه ر ئیستا دیاری ده که ین . یه کی به سه عات چه ند سه عاتمان به ده که وێ . ئه مه ش به پیێ دوور ونزیکی و پیویستیی زه وی یه که .
جوتیار (۳) : کوڕینه ، ئه گه ر وا بکه ن کاعه لی ره نگبیێ خه فته ی یه ک دوو سه عاتی به رنه که وێ .. ئیێ ده به خوای ئه و به وه ڕازی نابیێ .
جوتیار(۲) : ڕازی ده بوو نابوو چش .
ده روێش : گونامی ئیمه چی یه ؟ بابه . ئه ویش با به شدارینک بیێ وه کو ئیمه ، له وه زیاتر نه خوا هه نیێ ده گریێ و نه پیغه مبه ر لییێ خوش دیێ .

## (( ۳ ))

نۆکه ر : کاعه لی . چی بکه ین ؟ به قسه ی تۆیان نه کرد . ئه مه چه ند ڕۆژه ئاومان نه گه یشتوونیێ ، پیشسووش شتیکی وا نه بوو پیاو دلّی پیێ داکه ویێ !
کاعه لی : ئه وه کام سه ر ره قیانه کلکی خۆی ده بزیویێ و ده یه ویێ به رهه لستی قسه ی من بکات ؟
نۆکه ر : چیت عه رزکه م ، هه موویانن . سه رده سته شیان ده روێش سمایله . قوربان هیچیان کراسی بابی خۆیان به به ر خۆیان نه دتیوه و تیر نان نه بوون .. ئه و قسانه ده که ن . ئه دی ئه گه ر یه ک دوو سالّی دی به ری باغ و ره زه کانیان بخۆن ده بیێ چی یان لیێ بیێ ؟ ده بیێ چۆن هار بن ؟
کاعه لی : نایخۆن . نایخۆن . که للـه ی ره قیان نه رم ده که م . ئه وان ده ره قه تی من نایه ن . پیێ یان ناکریێ په نجه بازیم له گه لّ بکه ن .
نۆکه ر : ئه دی ئه گه ر کردیان ؟
کاعه لی : ئاخر چۆنی ده که ن ؟
نۆکه ر : قوربان ، قسه یان کردۆته یه ک . خوا ده زانیێ له پنه وه چه کیشیان په یدا کردبیێ ، ئنجا به زمه لّ ده دوێن و ترسیان نه ماوه .
کاعه لی : گوێ مه ده ئه وان قسانه . جاریێ پیم نالّییێ کیێ ده لّیێ ئه وان خاوه ن ئه و زه وی و زارانه ن ؟ بۆچی ده بیێ ئی ئه وان بیێ ؟
نۆکه ر : ئه دی ئی کیێ یه . ئاغه م ؟
کاعه لی : ئی خۆمه گه لحۆ ..

نۆکه ر : هه ی ده به ر زارت مرم . چۆن ؟
کاعه لی : ئه و جاره بچمه شاری هه موو شت ده برێنته وه ئنجا که لیژنه ی ته سویه هات به ناوی خۆماتی ده نووسێت و ته واو .
نۆکه ر : ئاخر بۆ لیژنه که ی ناسه لێنن ، مۆری ناکه ن و ده لێن هی کاعه لی نی یه .
کاعه لی : کێ ده وێرێ وا بلێ ؟ یه ک یه ک ئه وانه م پێ بلێ که زمانی ئه وه یان له ده م دایه که رۆژی خۆی هه له زمانی یه ک بکا ، با چاره یان بکه م ، چونکه شایه دو شوود ئاماده ن و شایه تی ده ده ن هه موو شت ده برێنته وه .
نۆکه ر : ئاغه ! ده روێش سمایل چ لی ده که ی ؟ غه فوور ، پیرۆت ، حه ویز ، کاکل ، مه نده ، مه مۆ و ..
کاعه لی : به س به س ، ناوی قاره مانانی رۆسته می زالم بۆ مه خوێنه وه ، باوه کو تۆ ئه ژنۆم نه له رزێ .
نۆکه ر : هه ی حه یفت نه کرد ئاغه م .. ناله رزم ، چی ئه مر بفه رمووی کراوه و چۆنی بته وێ وه هایه .
کاعه لی : ده برۆ . ده روێشم بۆ بانگک که ن .. با چاوێکی لێ سوورکه مه وه .
نۆکه ر : ده ی حه مه ، ڕاکه ، سه رکه وه بانگێکی ده روێش بکه بابێته خزمه ت کاعه لی [ حه مه ده ڕوا ]
کاعه لی : با له پێشه وه ئه و سمێلێ کلکه سه گه ئاقل که م . ئنجا ئه و سوار چاکانه ی دیش که ناوت هێنان ئاسانن. گوێت لێ بێ له گه لێ ئه و تاکه س به چانه درێژه پێدانی ناوێ . پیێ ده لێم ئاوه که به رداته وه . نه گه ر کردی باشه، ئه گه ر نا ..
نۆکه ر : هه ر لێره ده یکه مه قوربانی تۆ ...
کاعه لی : بناوانه که تینک ده ده م و لێ ناگه ڕێم چۆڕه ئاوێکیان بۆ بچێت . هه رچی چاندوویانسه هه مووی وشک ده که م .

(( ٤ ))

مراد : کوڕه کاکه ، له که لی شه یتان وه ره خوارێ . ئێمه چیمان پێ ناکرێ .له گه لێ ئه وانه چ ناکرێ .
ده روێش : هه تیو . چ بکه ین باشه . ره زو باغی خۆمان و ئه و خه لکه به سته زمانانه له به ر خاتری کاعه لی هه موو وشک که ین ؟ ئاخر پێم نالێی له پێناوی چی؟
مراد : کوڕه براله له پێناوی برا گه وره یه تی ، ئه وان سه ری گه وره ن ، ئێمه

رە عیبە ی ئە وانین ، ئـە گـە ر چە نگێنکمان لیٚ بدە ن بچینە کۆی ؟ هـاواریٚ وە بە ر کویٚ بە رین ؟

دە روێش : ئە وان . ئا وان ؟! ئە وان کێن ؟ ئا وانیش وە کو ئێمە بە ندە ی خوا نین ؟ کورە ئە گە ر ئێمە یە ک بین و لە سە ر هە ق بین ئە وان چي یان پیٚ دە کریٚ. پیاو بە . پیاو ! هە تاکە ی هە ر دە ماری سووکی و نزکە رایە تیت لە جە ستە دا دە بزویٚ .

مراد : لە گە ڵت نایە م ، کاکە ، واز لە و ئیشە بهێنە ، تا کاعە لی سارد دە بێتە وە و ئە و دە م دوو قسانی لە گە ڵ دە کە ین مە سلە تی یە ک لە نێوان دا دە کریٚ .

دە روێش : مراد پشتم بە رمە دە . بە قسە ی زورداران تسە فـرە مە خـۆ . ئە وە وازیشم هێنا ، هە موو ئاوە کە شم دا بە ر ، ئە دی زە وی بە کامان ؟ ئە تو نازانی گوتوویە تی هە مووی بە ناوی خۆی نووسیوە و هە ر ئە مرۆ گ سبە ی لیژنە ی نە سویە دیٚ و لـە سـە رَ نـاوی ئـە و تاپـۆی دە کە ن . ئێمە ش دە بیٚ وە سواڵ کە وین ، یان بچین لە سێبە ری کۆشکی کـاعـە لـی دا وە ک کـسۆکـان وە رکە وین ، داخوا ئاغاژن کە نگی کە وچکە شوربایە کمان بۆ دە نێریٚ . هـە ی لە منت کە ویٚ مراد . ئە وە لە بۆ هێندە دوو دڵ و کە م باوە ڕیت ؟

مراد : ئاخر کاکە ، هە ڕە شە ی لیٚ کردووی .. ئیٚ .. نازانی هە ڕشە مانای چی یە ؟

دە روێش : گوایا دە یە ویٚ بناوانە کە مان لیٚ بشکێنیٚ ؟ چۆن دە تـوانـیٚ ؟دە لـە و شە وە وە بترازیٚ بزخۆم هە موو شە وێک پاشە وانی دە کە م ، بزانم کیٚ دە ستی بۆ درێژ دە کا تا وە کو مارگە زانە دە ستی سڕ بکە م . وە رە . پشتم بە رمە دە . لە کە ل کاکی خۆت با پاسە وانی بکە ین .

مراد : ئاخر دە ت کوژن .

دە روێش : دە م کوژن ؟ با بم کوژن . خۆ بە خوێنی خـۆم دە یچە سپێنم کە ئـە و زە وی و زارانە موڵکی کاعە لی نین . با لە قە بر دە رم بێنیٚ تا لە کن لیژنەی نە سویە شایە تی بۆ بدە م . کورە مرادکە . عـە یبـە . شـوورە یـی یە ئە تو وا دە لێیٚ. ئنجا با بم کوژن . ئە من چیم هە یە و کیٚم هە یە . ئـە و تـاقـە کچۆلە نە بیٚ . دە ئە ویش پاش مردنم با خزمە تت بکات هە تا بە مێـردی دە دە یـت پاروە نانێک هە ر دە بیٚ بنجوات . هە ی لە منت نە کە ویٚ . مراد .

مراد : هۆ کاک . گە فی لیٚ کردووی . هە تا بە منیـشی گـوت بێـت بلێـم وازی لیٚ بهێنی .

ده رویش . ئه من وازی لیٚ بهێنم یان ئه و وازمان لیٚ بهێنیٚ ؟ وه ڵلا سه یره ! بـه لاٚم شووره لی یه مراد چی دی له دیوه خانیٚ له سه ر پیلاٚوان داده نیشی چاوه ڕوانی وه ی بی که نگین کاعه لی لوتفی له گه ڵت ده بیٚ و به دوو قسه ی خوٚش له ذیمه ت جودا بکاته وه .. کوڕه ، خوٚ تو منداڵ نیـت ، ئـاخر هـه تـا که نگی تیٚ ناگه ی ؟ ( ناوێنک بیٚ ده نگی ) هه ڕه شه ی لیٚ کردووم ؟! ئـنجا چی یـه ئیش له پیاوان ده قه ومیٚ ! ئه وه بستێنک لا بناوانه که به رناده م ده با که س بوێریٚ ده ستی بوٚ ببات .

## (( ٥ ))

( تاریکه شه وه ، ده نگی بزق و قوڕاو یلکه تێکه ڵ به ده نگی خوڕه ی نـه رمی ئاوی جوٚگان ده بن . حه یرا نێکی به کوٚل .

ده رویش : که ریم ! ئه وه ئه ستێره ی به یانه . ئاسمـان سپێتی تیٚ که وت . هێنـده ی نه ما وه به ره یان دابیٚ . ئه گه ر ده ڕوٚی . بڕوٚ .

که ریم : نا نه خێر . ناڕوٚم . بچمه کویٚ ؟

ده رویش : بڕووه مالٚ .. ئه وشوٚ نه نووستی . بڕوٚ سه رخه وێکی بوٚ بشکێنه .

که ریم : با هه تاو هه ڵ بیٚ .

ده رویش : چ باس نی یه . که س دیار نی یه .

که ریم : وا ده چم

ده رویش : له سه ر ڕیٚ خوٚت مرادکه م بوٚ بنێره .

که ریم : به لیٚ .. ( ده ڕوا )

( ده نگی حه یرانه که زیاتر ده بیٚ ) .

( گوێمان له ده نگی ته ق و شه قی ڕوٚیینی نـاو بـه رده لاٚن ده بـیٚ . ده نـگه که نزیک ده بێته وه . گوێمان له دهنگی پاچه به به رد ده که ویٚ )

ده رویش : داخوا مراد له خه وی سه د خه ر دابیٚ که ی وا زوو راست ده بێته وه ؟ ته نیایی ناخوٚشه . ده بوایه که ریم ڕیٚ نه دابایه . هه ی له منت نه که وی مراد . چوٚن وا بیٚ خه می ! ( ده نگه که ده بیٚ به دوو ده نگک ) . ده لیٚ پیٚ مـه ڕه له زه وی ده ده ن ؟! ئـه و پـاچ کاری یـه چ وه ختـی یـه ؟ توٚ بلیٚ به و تاریکوروونه کیٚ بیٚ له و ده ورو به ره بێلٚ کاری بکات ؟ هوٚ مه ولووده ! پیروٚت ! مام یادگـر ! هوٚو ئوٚمه ر ! نـاوه ڵلا . بیٚ ده هـه ر ئـه وان لێره نزیـکن . کوڕه

کێ یه وه ؟

(ده نگی به ردو ئاسن لێک دان به رز ده بێته وه ) ئـه وه کێ یـه ؟ بۆچ وه لاْم ناده یته وه ؟ کوڕه خۆ ئه وه ده نگه که له سه ر به ستـه کـه وه دێ ! تـۆ بڵـێی هاتبێ بناوانه که تێک بده ن ! یه ک نی یه .. دووه کوڕه ئێوه کێن ؟ ڕاوه ستن وا هاتم . شه ڕت بێ به پێمه ڕه لاشا نـێکت بینـمه خـواریْ . ده راوه ستـه .

(ده نگه که هه ر به رده وامه ) ڕاده کات . حه یرانه که ده نگی لێ هه ڵ ده بڕێ !

هه ی له منی غه ریبێ ماڵ وێران ..

ئه و ساڵه که ده چمه وه کاوله که فته نێ . ( له تاریکی دا )

ده راوه سته بۆم . ئاوا له فاقێت ده نێم . هه ی چڵکاو خۆر . هه ی سه گی هه له پاس .

ده نگێک : کوڕه ، شه فه . کوشتمی .

ده نگێک : به ری ده .

ده روێش : به ری ناده م . هه ی خوانه ناسی کافر . ده ته وێ ماڵی ئه و خه ڵکی خوایه کاول بکه ی !

ده نگێک : خنکاندمی . شه فه بم گه یه !

ده نگێک : به ری ده ده نا ده ت کوژم . ده . راوه سته . ئه جه ل شێتی کردووی .

( ته فه یه کی تفه نگ دێ )

ده روێش : ئه ی هاوار . ئه ی هاوار . بم گه نێ . بم گه نێ.

ده نگێک : لێده بابڕۆین .

ده نگێک : با ئێشه که ته واو که ین .

ده نگێک : هه ی ناپـه سه ند ئیشی چی و تـه واوی چی . ئێستـا بـه سه رمان دا ده ورووژێن . هه تاو هه ڵ دێ ده ناسرێیـن خۆت کـۆکـه وه بـا بـڕۆین ده نگی هه نگاوی دوور که وتنه وه یان .. ده روێش دێته وه به ر روناکی . شه رواڵه که ی به خوێن سوور هه ڵگه ڕاوه . )

ده روێش : ئای هاوار . ئه ی هاوار .(مراد په یدا ده بێ . یه ک دوو ته فه ی نزمی ده مانچه دێته به رگوێ . )

مراد : کاکه چ قه وما !

ده روێش : کوژرام .

مراد : هه ی کوێرابیم دایه . وا مه ڵێ . چۆن تۆ وا ده ڵێی ...

ده رویش :  ده ردم کاری یه .  ده زانم  ده مرم . ئه مانه تت  کیژوڵه که  بیٚ .
مراد : کاکه ! کیٚ  بوو .
ده رویش   ئه وان  بوون . من  ده مرم  به لاٚم  نه که ی  واز  له  زه وی یـه کان  بهیٚنی .
رای  بۆ  نه ده ی . ئه گه ر  له سه ر  مه حکه مانت  بگیٚریٚ .
مراد : کاکه . کاکه . وه ره  خۆت  به سه ر  شانم  داده  که م  که م  پیٚ  هـه ڵ گـه ڕیٚـن
بچینه وه  ماڵیٚ . تا  ده رمانت  ده که ن . یان  نا  .  ئیٚستا  گویٚ دریٚژیٚـکست  بـۆ
دیٚنم  ده ت گه یه نمه وه  ئاوایی . کاکه  قوربانت  بم. کاکه . ئه وا  هاتن . ده وه رن ..
وه رن .( خه ڵک  له م لا  له ولاوه  دیٚن . )

یه کیٚک : کوڕه  ئه وه  ده رویٚش  پیٚکاوه !
یه کیٚک : هه ی  ماڵی  ویٚرانم  ده رویش .
یه کیٚک : داخه که م  ته واو  بووه
مرتد : ته واو  بووه  یه عنی  چی ؟
یه کیٚک : مردووه . هه ناسه ی  لیٚ براوه . گوایه  تیٚ ناگه یت ؟
مراد : کوڕه ، ئاخر  چۆن  ده مریٚ ؟ چۆن  کاکم  ده مریٚ . ئه ی  هاوار . کاکه  ڕۆ . کاکـه
ڕۆ . ( سه ری  به سه ر  سنگی یه وه  ده نیٚ . راست ده بیٚته وه ) . کاکی  من  چۆن
ده کوژریٚ ! کاکی  خۆم ( ده ست  ده کا  به  پیٚکه نین ) .
یه کیٚک : ئه ی ، چۆن  ناکوژریٚ  یه کیٚکی  وه کو  تۆی  له  پشت  بیٚ !پشتـی  بـه  تۆ
ئه ستوور  نه بوو ؟
یه کیٚک : ئافه رم  قاره مان . ئه میر  روسته م !
یه کیٚک : ده ی  وه کو  ژنان  بۆی  بگری . یان نا . پیٚ بکه نه . وه کو  پیٚ که نیت
مراد : ( قاقا  پیٚ ده که نیٚ ) ئیٚوه  سه هوون . بۆچی  چی  بووه ؟ گرمها . گرمـه یـه ک
هات هه وره  تریشقه  بوو و  برووسکه ی  له  زه وی  دا . کوڕه  نا  بابه . ته قه یه ک
بوو .. ته ق . ته ق  .. ته ق .. ئـیٚ  زه لاٚمیٚکی  وه کـو  کاکم  بـه رده بیٚته وه و
ده مریٚ ؟ قه ت  وانی یه ! ( پیٚ ده که نیٚ ) .
یه کیٚک : ئه دی  ئه تۆ  له  کویٚ  بووی ؟ بۆچی  ته قه یه کت  نه کرد ؟  بۆ  ورته یه کت
له  ده م  نه هاته  ده ریٚ ؟ هه تا  هه تاو  هه ڵنه هات  له خه و  هه ڵ نه ستای ؟
یه کیٚک : هه ی  شیٚری  پیشت که ندووان . شیٚری  رۆژی  ته نگانان  ده  بزانم  چیت  کردو
چ  ده که ی ؟
مراد : کیٚ  کوشتی ؟ ئیٚو  کوشتتان .

یه کێک : بۆ خۆت وابڵێ .
یه کێک : بۆ خۆت وابڵێ .
مراد : هه ر که س بێت ، کوژه ره که ی هه ر که س بێت ، ده ی کوژمه وه . یا من ده بم یان ئه و ( ده گری ) .هه ی کاکه ڕۆ ! هه ی پشتی شکاوم .
یه کێک : ده خزمینه واز له و باسانه بێنن . یه کێک بچێ گوندیژێک بێنێ .. یان وه رن با هه لێ گرین .
مراد : من کوشتوومه ؟ نا .نا . من . نه م کوشتووه !
جوتیار (۲) : ده ک خوایه ئه و زوڵه هه ڵ نه گری .ئه وه ی ده روێشی کوشت . ده یه وێ ئێمه ش بکوژێت . ده ئه و زوڵمه هه ر بۆ خاوه نه که ی بگه ڕێته وه ! کچۆله که ی ده روێش دێ ) .
کچه : هه ی بابه ڕۆ ! وه ی داکه ڕۆ .
مراد : وه ی کاکه ڕۆ ! ( کچه له باوه ش ده کات ) .( لاشه ی ده روێش هه ڵ ده گرن . له دواوه یان مرادو کچۆڵه که ش به ڕێ ده که ون . تاریکی . ده نگی حه یرانه که دێته وه : )
« هه ی له منێ . هه ی له منی بێ که س و غه ریب و ماڵ وێرانێ »
( که ڕووناک ده بێته وه مراد به په شێواوی ده بیینن . له که ڵ ته واو بوونی هه ر ده نگێک حاڵه تێکی شڵه ژان و ڕاچڵه کین و هه له که سه ما ده نگرێ . )
ده نگک : مرادکه ، له کوێ بووی که کاکتیان کوشت ؟
ده نگێک : مرادکه . پشتت شکا ! ده بزانم چ ده که ی ؟
ده نگێک : : مرادکه . کێ دادت ده پرسێ ؟
ده نگێک : مرادکه ی بێ ده سه لأت . له چه نکه لی دڕندان دا له شه وی تاریکستان دا بۆ کوێ ده چی ؟ چیت پێ ده کرێ ؟
ده نگک : هۆ مرادکه ی غه ریب . مرادکه ی بێ که س .
مراد : نا .. غه ریب نیم . بێ که س نیم . تۆڵه ی ده شتێنم .

# دیمه نی سێ یه م

## -۱-

( ژووری دیوه خانی ماڵی کا عه لی )
کا عه لی : ئافره ت بوو به چی ؟ چێشت هه ر پێنه گه یشت ؟

ئاغه ژن : پیێ ده گا . جارێ سه برت بێ .

کاعه لی : هه ی به لاقی خێوی یه وه . هێشتا نه گه یشتووه ! وه ڵلا وا بـزانم له به رده می میوانان دا روو زه ردم ده که یت . ئنجا که ی تـۆ لـه وه گه ڕاویت سه رم له ناو پیاوان دا به رزکه یته وه ؟

ئاغه ژن : میوان و میـوانـداریی تۆ هه ر نه براوه . مـن خـۆم ، زینـه کی کچـم ، کاره که ران مردین له به یانی یه وه تا ئیستا هه ر ئه وێکی ڕنکخستنی داب و ده زگای میوانداریی تۆین . ئیستاش جه نابی په له مانـ ئنی ده کا . کچه که م پشتی شکا . له به ر میوانداریی تۆ ئاگای له دونیا نه ماوه . کـوڕه خۆ دنـیا گۆڕاوه .

کاعه لی : ده ی ده ی ده زانم .. ئاواتت هاته دی ! بۆچی چیم له ده ست ما ؟ هه رچی بوو نه برایه وه ÷ تیکت نه دا ؟ ژنی وا هه یه که ده چێته ماڵێک هه ر رزق به سه رماڵه که دا ده بارێ . هی واش هه یه ...

ئاغه ژن : ده ی .. هی واش هه یه وه کو من ماڵ کاول ده کا ؟! پیـاوه که ! ده پـێ بۆچی ئاواتی من کاول بوونی ماڵه که ی تۆ بێ کوێر چی ده وی ؟ دوو چاوی ساغ ! گۆایا کێ بێ حه زنه کات له ماڵی خۆی ئاوام و به ختیار بژت ؟ ئه دی که ده ڵێن دنیا گۆڕاوه .. هه ر ئه وه یان ناوێ ؟

کاعه لی : ئافرت .. ئه تو باسی دنیاو گۆڕان و مۆڕان مه که به ختیاری ؟ بـه ختیاری چی ؟ بۆچی له دنیادا هه یه ؟

ئاغاژن : هه ی قوربانت بم خوایه ، من سه رم له کاری تۆ سوڕماوه ! له خه ڵکی وایـه عه لیاغا ئاغای هه موو ناوچه که یه و ئه مرو نه هی له ده سته .. و به ختیاره . که چی هه ر خوا خۆی ده زانێ چه ند دڵ ناره حه ت و کڵۆڵه !

کاعه لی : خوا وای کردووه . گه وره یی و ئاغا یه تی ده داته هه ندێ که س تا بـاری خه ڵک هه ڵ گرن و پێوه یان ماندووبن ، ئیتر ماندوو ده بین .. خـه ڵک نـانمـان ده خوات .. ئیش بۆ عاله م ده که ین ، بـرا گـه وره یـه تیی یـان ده کـه ین ، ده یان پارێزین .. له سه ر ئه وه شه وه رازی نابن و چاوی حه سوودیمان پێ هه ڵ ده هێنن .( زینه ت دیته ژووره وه ) . کچم . که وچک و شوشه کانت ده رهێناوه ؟

زینه ت : ئا . بابه .

کاعه لی : خۆزگه وه کو شارستان مێزو کورسیمان ده بوو

ئاغاژن : هه ر ئه وه مابوو .

کاعه لی : ئه و میوانانه عه شایه ر نین . شارستانن به لوغه تن ، ده ترسم پاشمله
باسمان بکه ن .
ئاغاژن : نانیشمان بخون و باسیشمان بکه ن ؟
کاعه لی : ئه تو .. نازانی
ئاغاژن : پیاو که میوانی مالێک بوو ، هه رچی پێ درا مه منوونه و سوپاسی خودا
ده کا .
کاعه لی : بۆچی ئه مانه له پرسان روو لێره ده که ن ؟ هه ی له منت نه که وێ ..ئه وه
له که یه وه داب و نه ریتی دیوه خانه ت له بیر چوه ته وه ؟ یان ئه تۆش
وه کو ئه وان ده ته وێ ده رگای دیوه خان داخه ین و بلێین دنیا گوړاوه ؟
( ئاغه ژن به په سندی یه و پێ ده که نێ ). خوزگه ئاگات لێ ده بوو به هه زار
ئه م لاو ئه لاو هه تا رازیم کردن ئوتومبیله که ڕاگرن و نانی نیوه ڕۆ لای من
بخۆن .
زینه ت : بابه ئه وانه کێن ؟
ئاغاژن : هه ی به لاقی خێوی یه وه ! ( به پیکه نینه وه ).
کاعه لی : چی خوم ، ئه مانه حاکم و باش کاتب و مه ئمووری شارن . ئه فه نـدین .
بۆیه پێت ده لێم ده بێ داب و ده زگای شارستانانمان هه بێت . ئه تو به قسـه ی
دایکت مه که . خۆت باش ئاماده بکه هه نده ی نه ماوه بێن .
ئاغاژن : میوانن ، میوان ، ده نا ده م گوت هه ی به خێر نه یه ن . ئه وه چه نـد ساڵه
کارو کرده وه مان هه ر بۆ شارستانه . ( ده یه وێ بڕوات ).
کاعه لی : ئه تو نازانی . ده بڕۆ خۆت ئاماده بکه
زینه ت : ئه رێ ماڵێ پوورم بانگک نه کروان ؟ ( ئاغاژن ده گه ڕێته وه )
کاعه لی : نازانم
ئاغاژن : چۆن بانگیان ده کات ؟ بۆچی ئه وان به هیچ ده حوێنیته وه ؟ ئه وه ڵلا ! ده نا
جوامێری کوری پوورت ده لێ گوڵی مه جلیسانه ؟ هه ر له و ده وه شێته وه
له ناو شارستانان دابنیشێ و قسه بکات .
کاعه لی :هه ر له به ر ئه و بانگم نه کردوون .
زینه ت : له به ر ئه و ؟
کاعه لی : ئاخر کچم ئه ویش مه کته بلی یه ، یه کێکه له ده م رووته کان ، ده تـرسم
بێ له مه جلیس دا قسه یه کی هه رچی و په رچیانه بکات و دڵی میوانه کان
بره نجێنێ .

ئاغاژن : هه یه ڕۆ ! بۆچی شێته .. یا نه فامسه ؟
کاعه لی : کچی ئه تۆ نازانی چه ند جار له ڕووی من دا حه وت و هه شت قسه ی ده کردو خۆی ده دا پاڵ ئه وان . هه ر ئه وه نده ی نه ده ما بم خوات . ده بویست منیش ئیقناع بکات . ده من لێم قبووڵ کرد . به لاّم ئه مانه حاکم مه ئمووری میرین لیێ قبووڵ ناکه ن .
ئاغاژن : به خوا پیاوه که ، جوامێر چ قسه ی خراپی لێ کردووه . هه موو قسه کانی به نده ئامۆژگارین .
کاعه لی : به لێ . ده ته وێ ئه م ده م ڕووته نه سیحه تم بکات ؟ وا نی یه ؟!
ئاعاژن : پیێ ناوێ با له سه ری نه ڕۆین . ئه تۆ ئه وانت ناوێ . ئێنجا ئه مه بیانۆیه .
کاعه لی : ده برۆ زنی چاک ، کاره که مان راپه رێنه ( ئاغاژن ده چێته ده رێ )
زینه ت : بابه ، هه موو شت به که یفی تۆ ده بێت ، هه موو شتم سازکردووه .
کاعه لی : ئافه رین . کچی بابی
زینه ت : ( به شه رمه وه ) بابه . ئه ی که نگێ ده چی به شاری ؟
کاعه لی : جارێ نا . بۆچی وا ده لیێ ؟
رینه ت : وام زانی ئه تۆش به گه ڵیان ده که وێ
کاعه لی : نا کچم بۆچیته ؟
زینه ت : ئه گه ر ، ئه که ر چوویه شار .. خۆت ده زانی خۆت .. خۆت
کاعه لی : ئا ، ئا ، شته کانت بۆ دێنم ، له به ر خاتری تۆ ده چمه مغازه کان هه رچی شتی جوانی لیێ بوو بۆتی ده کرم .. خۆم ده زانم ( نۆکه رێک دێته ژووریێ ) .
نۆکه ر : ئاغا م هێنا م .
کاعه لی : ده برۆ بیان شۆوه و هه ر یه کـه ی لـه قاپێکی بکـه و جـوان لـه سه ر سینی یه کیان دابنیێ .
نۆکه ر . به لیێ قوربان نیو دیناریش قه رزار بوویه وه .
کاعه لی . نیو دینار . نیو دینار بۆچی ؟
نۆکه ر : ئاخر قوربان .. ئه مه میوه ی ئه و خواره یه و به قاڵ هه یبوو .. ئـه ویـش بیێ پاره نه ی دا ، هه روه ها ورده واڵه ی تریشم لا هه ڵ گه رتووه .
کاعه لی : دنیا ویران بوو .. ( له م کاته دا له ده رگا ده ده ن ) ده بـرۆ خـێرا .. ئیـش خۆت بکه (نۆکه ره که ده چێته ده رێ ) هه ر پـاروه هـه ر پـاره . عـه لی شیش به پاره . جگه ره به پاره . کشمیش به پاره . میوه به پاره . پاره ..پاره م نه ما !

( روو له زینه ت ده کا ) کچم زینه ت ره نگه میوانــه کــان بن .ده بــرۆ ده رێ بانه ت بێنن . ( زینه ت له به ر ده رگاری ناو ماڵ لاوو نـیـو راده وه ستێ و به چمکی چارزگه که ی لاده دات . تا میوانه کان یه کا یه کا به ریز دێنه ژووری ، ئه ویش ئاورێک ده داته وه و ده چێته ده رێ ) هه ی به خـێر بێـن . به خـێر . گه وره تان کردین . فه رموون . فه رموون .

## - ٢ -

حاکم : ئاغه . شوینه که ت خۆشه ، ئه م چیا سه وزانه ی هه موو له به ر ده م دایه . سه یری ! تا چاو برده کا هه ر باخ و دارستانه . باشه . به زه وقیت .

کاعه لی : راست ده فه رمووی ، ئێره م که دروست کرد ! ئیتر ..( قسه که ی ده برێ ) خۆشه به لێ . خۆزگه م هاوینان زوو زوو سه رت ده داین شه رت بێ ئێره ت بۆ چۆل بکه م و بۆتی برازێنمه وه ئه گه ر منداڵه کانت بێنی سه غڵه ت نابن .

جێگه مان خۆش و فێنکه . هه ر هاوینه هه واره !

باشکاتب : قوربان . له مێژ نی یه ئێره ی دروست کردووه ، جاران له ناو ئاوایی بوو .

کاعه لی : به لێ خۆی شاره زایه ، ئه و وه خت ده وری‌نـک بــوو . هێ هێ له و زه مانێ .. با چێنۆکی ئه وه ت بۆ بگێرمه وه هه موو جار قایمقام خۆی دۆستانی ده هاتنه میوانیم . نه بێته خۆ هه ڵکێشان خزمه تی چاکم ده کردن ، ئه ویش ئێره ی زۆر له لا خۆش بوو . تووه زانه لای گه وره پیاوانی هه ولێریش باسی کردبوو ، ئه وانیش به مدیری پۆلیسه وه و به سه ر حـاکمه وه و به معاوینه وه نـاو نـاو ده هاتن ، هه تا جارێکیان موته صه ریفیش ته شریفی هێنا ، سه یرم کرد ماڵه کۆنه که م شایانی ریزی ئه و میوانه گه ورانه نی یه ، له رووی ئێوه نـه لـێم . عه رزت ده کــه م ، هاتــم له سـه ر ئـه م گــرده بـه رزه ئـه و چـه نـد ژووره م دروست کرد . خه به رم بۆ هات که وه زیری به غدایه ش پاش چه ند رۆژێــکی دی به میوانی دێ . ئه وده م ده رونک بوو . هێێ .. ئیتر !!

باشکاتب : خۆزگه م به و ده م .

کاعه لی : به ته مابوو بێ به لاّم ئه و هه رایه ی به غدایه ی بــه ســه ردا هــات ، داموره زگا وه رگه راو نه هات .

حاکم : چاکت کرد ئێره ت دروست کرد ، زه زه رت نه کردووه به راستی جێ یه کــی به ربه ره ڵلاو خۆشه .. چاوه ندازێکی جوانی له به رده مه .

باشکاتب : ئه گه ر له بیرت بیٚ ، ئێره ش له گه ڵ ئه و باخچانه بوو که پیره مێره که داوای ده کرده وه .

حاکم : ( پیٚ ده که نیٚ ) . ها .ها .ها .

باشکاتب : به ڕاسته ئه و عاله مه چاک شێت بوون . هه مووی وه ک ده روێش حاڵیان لیٚ هاتووه . ئێستا پێم ناڵێی له به غدایه شتێک قه ومایه . لێره بۆچی بـزوی ده که ونه سه ماو هه لپه ڕین ؟

کاعه لی : شێت بوون هه روا ده بیٚ ؟! ئه وه ی ده یلێیٚ مرادکه ی پیٚ ده ڵێن . ئه وه هه ر له دیوه خانی من که وتبوو له سه ر خوانچه ده له وه ڕا . کاتێک ئـه و مه سه له ی جه مبوری و زراعی یه ی بیست شێت بوو . به لیٚ خوی که م عه قل بوو قه قه ت ئه و کاره به ته واوی شێتی کرد . ئێستر هـه ر ڕوژه ده رگای مه حکه مه یه کم لیٚ ده گریٚ و ده یه ویٚ ئه و له جێی من بیبێته ئاغا ! کێش؟.. مرادکه ! بابه . به خوڕایی شێت بوون نازانم چ بووه ؟ وه زیرێک چووه وه زیرێکی دی له جێگه ی دانیشتووه گوایا قابینه نه ما . کاریه ده ستان نه مان ؟ ده سته و دایه ره ی حکوومه ت نه ما ؟ هه مووی هه ر ماوه جارانیش ئـه و گۆڕینـه هـه ر ده بوو . به عه مری خوم کـه هاتـوجۆی حکـوومه ت ده کـه م چـه نـد جاز موته صه ڕیف و مدیرو پۆلیس هاتن و ڕۆیشتن .

باشکاتب : ڕاست ده که ی هه مووی وایه ، فه قه ت ذه وه ی ئه و خه ڵکه ی شێت کردووه قانوون که ی زه وی وزاره . کوڕه خۆ له وه ش نـه گـه یشتوون . قـه ت بڕواناکه م وه کو ده لێن وابیٚ .. بابه هه ر بۆ چاک کردنی کشتو کاڵه و هیـچی تر . گوایا ئه وانی به غدایه هه نده عه قڵه یان نی یه که نابیٚ ئـه و قزناغـانه تێک بچن ! چۆن شتێکی وا ده که ن دڵی ئه و هه موو برا گه ورانه بره نجێنن؟! نا . بابه . نا . شتی وا نی یه !

کاعه لی : ئیوه خۆش بن ئێمه باکمان نی یه . ده فه ڕموون ده ی . با نانه که بخوێن . ( خه ریکی نان خواردن ده بن ) .

ئه فه ندی : ( ئه وه ی له چایخانه که دانیشتـوو ) ئاغـه م لای ئێـوه باشـه ، شوکـری خوا بکه ن .

کاعه لی : چۆن ؟

ئه فه ندی : ڕووی تۆدا نه لێم له شاران وه کو ده لێن منداڵه وردتـکه لـه کوڵانـان چه پڵه ده کوتن و هاوارده که ن : ده ره به گک !

باشکاتب : ناماقوولیان کرد . هه تیم و تاری خوێرین . نا بابه نا شتی وانی یه . شار پیاوی تیٚ دا ماوه
کاعه لی : نه بیته خۆ هه لکێشان لێره که س رای نه کـه وتووه تـا ئـێسـتا سـه ر بیزێوی . به لاٚم ئێمه ش هی وامان هه ن ...
حاکم : کیٚ ده توانیٚ په لَ بزێوی بکات ؟
باشکاتب : خۆ له رانیه هه تیوێک به گوٚ ئاغایان دا چوو یه کسه ر له به ندیخانه یان توند کردو له سه ر دیواری ژووره کانی ئیوتیلی سلیمانی بـه ق لـه می ره ش نووسیبویان که ئه و کابرایه ده لیٚ دایک و خوشکی پیاو له پیاو حه لالّه .
کاعه لی : حه قه مستی بێت .
ئه فه ندی : جا فایده ی چی ؟ ئه مه لاوێکه هه ستاوه و شاره و شار ده ی گرێته وه و دیٚ به دیٚ تووشی ده بیٚ . به هیچ چاره ناکریٚ .
باشکاتب : ( به تووره یی و ئیشاره ته وه ) ده لێی له ویٚ هاتی یه وه . جه نابت نازانی قسه بکه یت .
کاعه لی : لێی گه ریٚ . ئێره مالَی خۆیه کی.
ئه فه ندی : خۆ له خۆمه وه شتێکم نه گوتووه ، ئه وه ی به به ر چاوه وه تیٚ ده په ڕێت ئه وه تان بۆ ده گێرمه وه .
باشکاتب : روعا بکه ن با ئه و قوناغ و دیوه خانانه مان لیٚ تێک نه چێت .( گورج )
حاکم به گک ! ناو ناو شیعر داده نێم . جارێک شیعر یکی ۲۱ مه سره عیم له سه ر ژیانی کورده واری دانا .
حاکم : قه ت نه بیٚ ؟ ده با بزانین .
باشکاتب : به لیٚ وا بیری لیٚ ده که مه وه ، فه ردێکیان زۆر به ولَم بوو ، هه ر له بیرم ماوه ( پارونکی گه وره ی له ده م دایه ) ده لیٚ
حاکم : بلیٚ ده لێم . ئه ی گوایا ئی خۆت نی یه ؟ ( پیٚ ده که نیٚ ) .
باشکاتب : ئاوه دان بیٚ . ئحو ئحو ئحو .. ( قورگی ده گیریٚ ) .
کاعه لی : ماستاو بێنن . ده ها قومێک ماستاوی به سه ردا بکه .
باشکاتب : ئحو ئحو ئحو .. په وری یه گه رووم .
حاکم : چ . هه لبه ستێکه ! به ڕاست ئه وه یه هه لبه ستی گیر که له قـورگ دا گیر ده بیٚ .
باشکاتب : ( ئاو ده خواته وه ) له عنه تیان لیٚ دا . هه موو خه تـای ئـاژاوه چیـیان بـوو

بیریان ورووژاندم . به لێ . به لێ گوێ بگرک واهات :

ئاوه دان بێ مالّ وخانه ی کورده کان

هه روه کو چۆن ئاوه دانه دیوه خان

دیوه خانه مه زهه ری کوردایه تی

خوایه هه ر ئاوا بێ . هه ر ئه و ها بێ تا ئاخرزه مان .

ئاوودانی ئه یره بۆ قه لب و گیان

ئاوی دانی ساقیانی ساقییان .

هه موو : ( پێ ده که نی ) . هه ی ده م خۆش !

حاکم : ( روو له ئاغا ده کات ) خوا زیادی کات .

کاعه لی : ده فه رموون بچینه ناو باخه کانه وه له وێ چا بخۆینه وه ؟

حاکم : زۆر باشه . بابچین . ( هه لّ ده ستن . گوێمان له ده نگ و پاشان یه ک دوو ئه قه ی تفه نگک ده بێت .. له دووره وه .. ده چنه ده ره وه . )

نۆکه ر (١) : ( له گه لّ یه کیکی دی دیته ژووری ) ئه مه ش وا لیره ئیمه ش ئانه که مان بخۆین پاش بیان به ین بۆ ده ره وه .

نۆکه ر (٢) : لام وابێ بیان به ینه ده ره وه باشتره ، ئه وه ک له پڕ بگه ڕینه وه .

نۆکه ر (١) : له رێ ئه و ته قانه چی بوون ؟

نۆکه ر (٢) : نازانم . ئه رێ ئه نجابی دواسکالای مراد چی بوو ؟

نۆکه ر (١) : نازانم

نۆکه ر(٢) : ئه رێ پاسیان لیوه کرد ؟

نۆکه ر(١) : نازانم . ئه رێ ئه نجام چی ده بێ ؟

نۆکه ر (٢) : نازانم .

دیمه ی چواره م

«چاپخانه که ی پێشوو »

مراد : له سه ر کورسی یه ک خه وتووه ، راده چلّه کێ .. هه لّ ده ستیته سه ر پێ . قاله ، قاله که .

قاله : له تاریکی یه وه وه کو تارمایی یه ک ده رده په ڕێت به لێ ، مامه که وره

مراد : کورم ، ها ئه وه پاره ، حاجی ئه مین راسپیره له شار جورته که وشێک و مراد خانی و شه روالێکت بۆ بینێ.چی دی با پێ یه کانت به دارو درپی په رژینی ره زو باغه کان شه قار نه بێت ، خۆت ئاماده بکه ده ت نێرمه مه کته بێ .

قاله :مه کته ب ؟ بۆچی مه کته ب ؟

مراد : کوری خۆم ئه ریٚ وه لَلا مه کته ب ، وه کـو منداڵانی شارستان . ده زانی مامه حمه دی پینه رۆزی خانه خوێنم له شار کورێکی هه یه هه ر له تـه مه نی تۆ دا بوو وه ک بولبو ل کاغه زی بـۆ بـاوکی ده خوێنـده وه . کوری خـۆم مه کته ب بۆ تۆو بۆ هه موو منداڵانی هه ژارانی شاور لادیٚ .

قاله :باوه ، ده م که یه ئه فه ندی ؟

مراد : رۆڵه م ده ت که مه خوێنده وار . تۆڵه ی خـۆم ده که مه وه . تـۆڵـه ی خۆم و خه ڵکی بیٚ سه وادی وری گێژی ولاَته که م به تۆ ده کـه مـه وه ، ده ت کـه مه گوڵێک دایکی کاره که رو باوکی ره نجبه ری ماندووت بۆنت بکه ن و بگه شێنه وه. ( قاله ون ده بیٚ ) . ئیتر ره نجه رۆیی با به س بیٚت . با ده وری ئازادی بێت . ئازادی .

ده نگێک : میاوه .. میاو .. میاوه .

ده نگێک : خت . خت .خت .

مراد :ره نگی ده گۆرێت . تووره ده بێت ، هه ی ده ردی ره ش . سه گی سه گبابی بیٚ ئامانی چاوچنۆک . سفره دری ماڵ ماڵ وێرانی ته یری شووم .

ده نگێک : میاو.. میاو .. میاو.

ده نگێک : خت . خت .خت .

مراد : میاوه له دایکت . میاوه له باوکـت . لـه بـاوو باپیـرانـت ، ئـه وه ی دیلی و خزمه تکاریی تا بینه قاقا نوقمی گه وجی و سه رشۆری . بۆچی من کۆتری سپیم وێنه ی سه لکه پشیله له یاخه تان ده ده ن ؟ ( سه ری به رده داته وه . ناوێک. ئنجا پیٚ ده که نیٚ ) ها .ها .ها چاچی یه ؟ دنیا سه گیشی تیٚ دایه و پشیله شی

تیٚ دایه . ئه مما شه رت بیٚ میاوه بریان بکه م . مراد نه بم ئه گه درکه شیان له بیٚ ده رنه هینم . من وا به ئاوات گه یشتم ، دوا سکالاٚمان خوێندرایه وه . ئای له و زیٚ یه گه وره هه ر به ردم تیٚ فریٚ دا و قووتی دا .. ئه مما نه وه ستام به رد له دوای به رد تیم هاویشت ، هه تا بنی گرت و دوا به ردم سه ری له ئاو ده رهێنا . سکالاٚی دواییم وه کو بزمار گرتی به زه قه ی چاویان ! ده با سمێڵ بابری ترسه نۆک بیٚ ته ماشا بکا . به چاوی خۆی ببینیٚ چۆن هه موو شت به که یفی دڵی من بوو ! ( تاوێک بیٚ ده نگس . مۆسیقایه کی به گوڕ . پاشان به نه رمی له ده رگا ده دریٚ . ) کیٚ یه وه ؟ فه رموون ! ( حاکم به جل وبه رگی

قازیی جارانه وه باشکاتب به جا ویه رگی مه لایانه وه دینه ژوور . ده فته ریکی
گه وره یان پیێ یه ) .
قازی : ئه سسه لامو عه له یکوم .
باشکاتب : وه سسه لامو عه له یکوم .
مراد : وه عه له یکه سه لاْو .. فه رموون .
قازی : نازانم ده مان ناسیته وه .. خالێ مراد . یان نا . ؟
مراد : هه ر چۆنیک بیت خۆ ئیوه هاتوون . میوانن ده فه رموون دانیش .
قازی : نا بۆ دانیشتن نه هاتووین .
باشکاتب : با بیت بلێم ، ئه وه جه نابی حاکمه و منیش باشکاتبم .
مراد : ده شێویێ و خه م دای دهگریێ ، یه ک یه ک نی یان ده چیته پیشه وه و به
چاویکی زه قی واق رماو نی یان ده روانیێ . ئه مه حاکم . ئه مه ش باشکاتب (
تاوێک ) دیسان . دیسان !؟
قازی : تیمان مه روانسه ! دلْت هیچ نه کات . ئیمه به ده م بانگی تووه هاتووین
باشکاتب : ئیمه ش گۆڕاوین ، پیاوی جاران نین .
مراد : قه ت نه بیێ ؟
باشکاتب : بۆ نابیێ !؟ ئه ی له و خواره دا شۆرش نی یه . ئیوه نالێن هه موو شتیێ
قابلی گۆڕانه . دوای هه موو کاره ساتیک خۆشی یه . پاش ئه وه ی دوا عه ریزه ی
تۆمان هاته به رده م . جومهوری چاویلکه یه کی تایبه تی بۆ ناردین که له
چاومان کرد ( چاویلکه یه ک به ده سته وه ده گریێ ) به ڕوونی هه موو ده ردی
دلْی تۆو هاوڕیکا نتمان لا ئاشکرا بوو .
باشکاتب : هه ر بژی جومهوری ( مراد پیێ ده که نیێ )
قازی : هه تا جل و به رگیشمان – سه یر که ، بروانه هه مووی گۆڕا . ئیتر گرفتی زه‌وی
وازار کراو لافاوی دادو هه ق په روه ری به ره لْلای دنیا بوو .
مراد : به خوای به خوایێ . ئینه . قسه ی ذینه خۆش . ده بیژن بیژن .
باشکاتب : وه کو جه نابی قازی یه فه ندی عه رزی کردن هه مووی وایه ، ئیمه ش
بۆیه هاتووین ، رازو گله یی تۆ چاربکه ین .
باشکاتب : بیێ گومان لیێ مان نارازی بوویت .
قازی : ده بیێ ئه مڕۆ گله ییت نه مینیت . ئه وسا رۆژیک بوو وای ده ویست و ئه مڕۆ
رۆژیکی دی یه . نابیێ لاپه ڕه ی کۆن هه لْ بده ینه وه ، هه ر سه یری ئه مرۆ
بکه .

باشکاتب : ئیتر خۆ دڵت پاک بزوه .

مراد : قوربان ئه وقسالنه ی پیٚ ناویٚ .. به لیٚ عه رزوحاڵ بوو جیبیٚ خوی گرت و ئاواتم هاته دی به لاٚم یه ک داخم له دڵ دایه .

باشکاتب : واخ !؟ دڵ ؟ بلیٚ چی یه ؟

مراد : ئیٚستا من بروام کردووه . به لاٚم ده مه ویٚ خه لکه که ش پیٚم بروابکه ن . ده مه ویٚ میاوه داره کانیش بروا بکه ن .. که .. وایه ..

قازی : ده زانم مه به ستت چی یه . به لیٚ .. به لیٚ .. ئه هلی دیٚ ، نه ک هه ر ئیٚره ، هه موو کوردستان به چاوی ریٚزه وه ده روانته کردو کۆششت .

باشکاتب : کیٚ بروای ده کرد . مرادکه یه کی نه خوینده وار ده پانزده ساڵ کۆڵ نه دا . هه ر هاتو چۆی سه را بکات و سکالاٚ دوای سکالاٚ بنووسیٚت و پـه نجه بنیٚته ناو چاوی ده ره به گ و ده ته ودایه ره ی حکوومه ت هه ر نه به زیٚ هه‌تا ماف وه ده س ده هیٚنیٚ ؟ئه مه نی یه مه به ست ؟

مراد : ده م خۆش !

قازی : ئیتر هه ر ئه مرۆیه پیٚت بروا ده که ن . ئنجا رات له سه ر چی یه ؟

مراد : ئه وه ی من ده مه ویٚ ئاسانه : ئه گه ر زاڵم لیٚ بگه ریٚ . پیٚکه وه ده بن گورگ و مه ریٚ . من ده مه ویٚ دنیا . دنیٚی دادو یه کسانی بیٚت . ده مه ویٚ برایه تیی راست له دلی هه موو خه لکه که جیٚ گیر تالی ده کا . نه بوونی و سه رشۆری .

( حاکم و باشکاتب ون ده بن . ) (چاپچی و یه ک دوو که سی دی دیار ده بن . بیٚ ئه وه ی مراد بیان بینیٚ ) ده مه ویٚ هه ژاران به سه ری فـرازی بچنه دایه ره کان و هه قی خۆیان بدریٚتیٚ . به چاوێکی ـ سووک سه یر نه کریٚن . ده مه ویٚ سه به رز بیٚن . ئیتر ره نجه رۆیی با به س بیٚت . ده وری ئازادی یه . ئازادی !

ده نگیٚک : میاو . میاو . میاو

ده نگیٚک : خت . خت . خت .

مراد : هه میسان سه گک بابه داک شره کانی میاو !؟

ده نگیٚک : میاو . میاو . میاو

ده نگیٚک : خت . خت .خت .

مراد : میاوه چیته ! بۆ به ختی خۆتـان بمیا وینن بـۆ گـۆڕی ڕزیـوی بـاوکه
سه رشۆڕه کانتان . ( وه ک سه گه ن ده نگک بدا ) حه له له له . حه لـه له له .
هه حه له لله له .. ده ی ده ی . تاوێک پێ ده نکه نـێ ) ها .ها .هـادنـیا یه کـی
سه یرو خۆشه ! کێ بڕوای ده کرد سکالای من سه ر بکرێت . ئه وا به زه ققه ی
چاویان سه ری گرت . باخی گـرده خـه ج ده بێته وه هـی خۆم . قـۆڵی لـێ
هه ڵ ده ماڵم . وه ک بووک خزمه تی ده که م . سه رویه چه مسی داره کـان بـه
تیشکی به یانی زێڕین شانه ده بێ و هه زاران هه زار ئه ستێره ی سه وزو سوور
وه ک شیری مه مکان خۆشاوی شیرین و مزریان تێ ده گه رێ .
شه رت بێ به که م بۆ خه ڵک ببه شمه وه با هه موو ڕێبوا ران بێن له سایه ی
باخه که م دا بحه سێنه وه خۆ تێربکه ن و دیاریش بۆ ماڵ و منداڵیان ببه نه وه .
مورنه ده لیێ گه رێ با وابێ !! ها .. ها .ها
ده نگێک : میاو . میاو .میاو .
ده نگێک : خت .خت .خت .
مراد : کورنه ، ده به س میاوت بێ ، هه ی گوو به ردینی باوکت . هه ی بێ ئابڕووی
جانه وه ر . هه ی کرمی پیسی ناو گه ناو . خۆ تۆ منت کوشت بۆ هـه رچی
ده چم میاو . میاو .هه ر کـارێ ده کـه م میاو .میـاو . هه ی ڕه ششـاو ! هه ی
نه فرین .
ده نگێک : ( به رده وام ) میاو . میاو . میاو .
مراد : که لله م تی قی . ئای له و ده نگه به سامه ! ده لێی شیری تیژه به ند به ند
په رده ی مێشکم هـه ڵ ده بڕێ . ده لێم گه رێن . هێنده م نه ما وامردم !
هه ی هاوار . وه ی بابه ڕۆ .. وا ئه و پشیلانه جومهوری یـان خـوارد . دادیـان
خوارد. ئازادی یان خوارد . قازی یه فه ندی . باشه فه نـدی ! ئێـوه بۆ قسـه یه ک
ناکه ن ؟ حه مه ره سوول ، مسته فا .. کاکه ئـه حمـه د . وانـی یـه ؟ .. جوامێر .
زینه ت ؟! کوڕم قاله .. قاله ( به گریانه وه ) .
قاله : ( دێته سه ر شانۆ ) ئه وه کێ بانگم ده کا ؟
مراد : منم .. من . وه ره کوری خۆم .
قاله : ئه و لێره ی . وا هه ر خه ڵکه به شوێنت دا ده گه ڕێن و پرسیارده که ن .
مراد : کوڕم پێت گوت که وش و مراد خانی و شه رداڵت بۆ بێنێ ؟
قاله : که وشی چی ؟ مراد خانی چی یه . مامه گه وره .

مراد : ئه ی پاره م نه دایه ی بچیه لای حاجی ئه مین ؟
قاله : که ی ؟ ئنجا که وش لزچی یه ؟
مراد : بۆ مه کته ب . ئه و پایزه ده ت نێرمه مه کته ب . هه ر چیت بـووێ بـۆت ده کرم . پاره م بوو . باخ و ره زه کانم وه رگرتـه وه . ها هـا ها ! کـوڕه چایچی هه ئه تۆ ماوی پێم بڕوا بکه یت که سکالاکانم سه ریان گـرت ده نـۆش بڵێ « نا » .. تاگه ی دوو دڵی ؟-
هه موویان ده زانن ، هه تا زینه تی کچی ئاغـاو جوامێری کوڕی پووریشی . هه موو مه زانن . له گه ڵ حه مه ره سول و ستـه فاش رێنک کـه‌وتـووین و لـه پاشـه ڕۆژی زراعه ته که مان دواین . ئه ی قازی یه فه ندی تازه ئه هاتی یه لام. ده بۆ بزر بوون چی تر .. میاو . میاوه مه که ن . که لله م ته قی . سندان میاو! ره شا ومیاو ! میاو میاو ! ئێوه بڵێن هه موو که ڕن ، کوێرن ، نـابیـنان . ئیتـر یان ئێوه شێت بوون ، یا من ( پۆلیشێک و یه ک دوو پیاو دێنه ژوور )
پۆلیس : کوا . مراد ؟
مراد : بۆچی ؟
پۆلیس : ده بێ له گه ڵمان بێ یه شار .
مراد : من ؟ کێ ده ڵێ . من مرادم . دنیاکه وا گۆڕاوه . خوشم له وه به گومانم که من مردام . کێ ده ڵێ من ئه و که سه م که باوکم ناوی نـاوم مرادی بـێ مـراد ؟ ده‌ ڵێم گه ڕێن ، مێشکم ته قی . نایه م ، نایه م .
یه کێک : خاڵ مراد ، بۆیی له که ڵمان نایه ی . خۆ وه چینه شار . گـوایا تـۆ کۆلت داوه ، کێ هه ندی تۆ شاره زای شاره ؟
مراد : راست ده که ی برا . به لام ئه م جاره دڵم خه به ر ده دا که نـه چمه شار .
یه کێک : بۆچی تۆ لات وایه بۆچی ؟
مراد : بۆ هه رچی بێ
پۆلیس : نابێ . ده بێ هه ر بێی تا بچین .
مراد : بۆچی ؟ ئه مه چ ئه مرێکه ؟
پۆلیس : ئه مری حکوومه ته . (مراد ده شڵه ژێ )
مراد : ئه ی هاوار . هه ی بابه ڕۆ !
قاله : ( ده گری ) هه ی مامه ڕۆ . هه ی بابه ڕۆ .
یه کێک : ( ده م له پۆلیسه که ده قووچێنێ و به چاو ئیشاره تی بۆ ده کات . ) نا .

نا . نا ئه ی نازانی قایمقام به دووی دا ناردووی تا سه ر له نویٚ باخ و
زه وی یه کانت بوٚ تاپوٚ بکه نه وه و توٚش ئیمزای بکه یت .
مراد : ده وا بلیٚ بیٚ قه زابی . ئنجا توٚش بروات کرد که سکالاکه م سه ری گرت و
چی ویستم وا بوو
پوٚلیس : به لیٚ . به لیٚ . ده فه رموو . ؟ ( ده ی به ن )
قاله : مامه روٚ . بوٚ کویٚی ده به ن ؟ ( دوویان ده که ویٚ )
چایچی : ئیتر بردیان .
دانیشتوو (١) : بوٚ شیٚتخانه !؟
چایچی : بابه بیللا شیٚت نی یه . وا شیٚت بوو ؟
یه گیک : به خوا دلٚم پیٚی ده سووتیٚ.
چایچی : هه ر کاری دلٚ پیٚ سووتانه ؟ خوٚ ده زانم له سه ر هه ق بوو . به لاٚم چی...
یه کیک : کاکی برا . تا ئه و بابه له و کونه وه بیٚت .. ئه وا سه دی وه ک مراد
به سه ری ده که ویٚ و شیٚت ده بیٚ .

شانونامه

# « مار »

د . نافع ئاكرەيى

شانو ب رەنگێت تازەو جوان رووهن دبيت .. دەهول‌و زورنا دێ هێنه ژۆرێ‌و كۆمەكا كچ‌و كورا دهێنه ناڤ شانويێ‌داو داهوەتێ دكەن‌و جل‌و بەرگێت وان ب هەمى رەنگانەو هەمى جورێت دەهواتێ دكەن .. ب هارى‌كارى‌يا فانوسا سيحـرى يان ژى ڤيديويێ ل ديوارێ پاشێ شانويێ «محمد عارف» دێ ديار بيت‌و هندەك سترانا بێژيت .. د ناڤ شانويێ‌دا ژى چەند جحێل‌و تولاز دێ لەيزن‌و هندەك ژى دێ دەهواتێ كەن پاشى «حەسو ، حەسەن زيرەك ،» وەكو ئاشوپەكێ دێ ل لايێ پشتێ سترانا بێژن ، گولبهارو تەحسين تاهاو تيپا دوهوكێ ژى دێ وەسا هێنە ديتن دگەل خوشترين ئاوازو سترانێت كوردى .. ل لايەكێ شانويێ‌ڤە مروڤەك دێ هێتە ژۆر ب ميكيـا جێ وەسا يێ هـاتيه دروستكرن كو گەلەكێ سەيرە ... دێ خۆ نێزيكى كچەكو كورەكا كەت كـو مژولێت ئاخفتنێ‌نه ...

كچەكە : دێ وەرە مەمو دا دگەل خەلكێ ولاتێ خۆ ب كەڤينه كەيف‌و سەفايێ ..!

كورەكە :ـ زينا خانى ئـەزێ دبينم خوشى‌و شـادى‌يامـە يا ب زەحمـەتە نـاگەميتـە سەرى ..!

زين :ـ هندە يێ رەشبين نەبە ...!

مەم :ـ دوستا روحا من تو يا د بينى گۆرگەو ريڤى يێ د كەتينە د ناڤ رێزێت مەداو دڤێت مە ژ يەك كەن ...!

زين : مللەتێ‌مە هندە يێ د خوشيادا كو گوهێ خۆ نادەتێ ... ئەو دوژمنن ...!!

مەم :ـ ئەڤە ئالوزيا مەيە ..!ل بەر شاهى و دەهواتا مە ئاگا ل پيلانێت دل‌پيسا نى‌يە .

زين :ـ لێگـەرێ بلا ئـەڤ دەمێ‌مە يێ‌خـوش‌بيت .. بلا صـوبە ئـاگر تـەرو هيشكا نەهيليت ..!

مەم :ـ چەوا وەسا دبيت ؟ ئەو مروڤێ د رۆژێ‌دا دژيت دەبيا دوينێ ل بيرێ بيت‌و ژ بير نەكەت‌و ئەو چـەوتى‌و نەراستێت هـاتينه رێكـا وى دوينى‌و ئەڤـرو دەبيا

سوبەینێ ئەسپی وی ئەلوکومینن و ب رووناهی یەکا چاك دەرگەهێ سوبەینێ لێبدەت و ئەکات .... دا ئاڤاکرنا پاشە رۆژەکا خۆش و بەختیار نە بو خۆ بتنێ بەلکو بو زاروك و ئەڤێت خۆ دگەل داهاتێت ولات و مللەتێ خو ..!

«دەنگەکێ زڕو ناخۆش ل پشت شانوییێ د هێت دگەل لڤلڤینا وی مرۆڤێ سەیر هەر وەکو ئەو یێ ئاخڤێت ..»

دەنگ :ـ ئەڤە چەند سال و زەمانە ئەز دگەریم دا ریکەکێ ببینمەڤە ڤان مرۆڤا ژ یەك ئەکەم و خەم و نەخوشی یا بێخمە د ئاڤدا ... گەلەکا ب زەحمەت بوو .. چونکە ریکەك نەبوو وان بەلاڤبکەم .. بەلێ نهو من دیتەڤە .. ئەز ڤاوستم .

هیندەك دەنگ و گازێیت ناریك وەکو دەنگێ عەڤری و رووناهی یا شانوییێ دێ رەوشەن بیت و توندی ڤەمرییت .. هەمی خەلکێت د ناڤ شانوییێ دا دێ دەرچن و ڤاوست دێ هێتە د ناڤ شانوییێ داو ب ئالوزي دێ خۆ مەلاڤێژیت و دەهواتێ کەت .»

ڤاوست :ـ ڤێ کۆمەلگایێ چ توخمە مرۆڤ تێدا دژین .. ئەڤ مرۆڤە چو تشتا نزانن غەیری لاڤژەو ستران و خوشی یا ... مەزنێ وانیش گەلەك ئەو خوش دڤێن و ئەوان ژی ئەو گەلەك خۆش دڤێت دەبیا دیوارەکی د ناڤبەرا واندا دروستکەم و وەسا لێبهێن کو دەیك و براو باب ژ یەك ببنە دوژمن ..!

«ل ڤی دەمەیدا پیرەمێرەکێ ب جل و بەرگێت سپی و جوان و ریهێت درێژو دارەکێ درێژ د دەستیدا دێ هێتە ژوری :ـ

مرۆڤەکە :ـ ئەڤ دونیایە هەمیا پیچە
باشی ریکا مرۆڤێ چاکەو
خرابی رێبازا کەسێ ب سیچە
بەرهەمێ چەپەلیێ هەمی دەما بێ لیچە

ڤاوست : ئەڤ نەزانە چ دبێژیت ..! هو .. هو .. مامو .. تو کی و تو چ دبێژی .....؟!

مرۆڤەکە : ئەز بابا تاهیرێ عوریانم
هوزانڤانێ میللەتێ کوردانم
هەر کەسێ ب بێژیت وە نی یە
با بزانیت ئەز ئەڤینداری وانم .

ڤاوست : ئەز هوزانڤانا نەیناسم ... هوین خەلکی سەر رێ دبەن ..!

مرۆڤەکە :ـ هوزانڤانە رێ نیشاندەر
ئەڤینداری رێیا بێکەدەر
هوزان ئازادی و خوشی یە
دوژمنێ وێیە مەغول و تەتەر

**فاوست** :ـ كوڕو دێ هەره .. تۆ يێ د ناڤ بيرو بروايت رومانسیو ميسالىيا كـەڤندا دژی ... كەنگی ئەڤرو بازەرێ وان بيرا مايه ...؟!

**بابا تاهير** :ـ بيرا چاكیو باشی و راستیێيا كەڤنەو نوێيەو ل پاشه رۆژێ ژی هەموو خودان ويژدان بو وێ ڤندێ خەباتێ دكەن .

**فاوست** : دێ هەره .. هەره .. تو د چو ناگەهی .

«دێ ل شانوییێ دەرچیت»

**بابا تاهير** : هەڤالێت خوشەڤی «دێ دگەل خەلكێ ناڤ هوڵێدا ئاخفيت»هوين دزانن راستیو خاری هەمی دەما ل بەرامبەری يەك رادوەستن حەقو ناحەق ، رووناهیو تاری ... هەمی دوو دژن ل بەرامبەر يەك رادوەستن .... ئەڤرو ئەز چيروك بێژێ ڤێ شانوییێمە .. ل شارەكی ... ل بازەرەكی .. ل هەريمەكێ .. ل دەڤەرەكێ .. ل پێش چەند دەمو زەمانا .. خەلك د خوشيادا دژيان ... هەر ئەڤرو ل بەرچاڤا بـوو .. بيرا سوبەی نەدكر ... زكێ تەژیو كەيفو سەفا هەمی هيڤێت وان بوون .

شولا وان كوچەریو چاندنو شايیو لاڤژەو خوشی بوون ... ميرێ وان ... مەزنێ وان/بو هەميا وەكی برای بوو .. وی گەلەك ئەو خوش دڤيانو وان ژی ئەو خوش دڤيا .. جلك ل بەر خو نەدكرن ئەگەر يەك ژ ملەتێ وی يێ رويس با .. خارن نەدخار ئەگەر زانیبا مروڤەكێ وی يێ برسیيە .. خەلكی هەميا ب سەرێ وی سويند دخارو ژيێ دريژ بوڤخواست .

«دەنگە دەنگو هەوار دێ ل پشت شانوییێ هێن و خەلك دگەل ميری دێ هێنە د ناڤ شانوییێداو روناهی دێ بابا تاهيری هێلیتو دێ خەلكێ دناڤ شانوییێدا ئاشكرابن ..!

**مير** :ـسەركەوتنا من يا هەوەيه .. خوشيا من هوينن .. ئەگەر هوين نەبن ما ئەز ب چ دڤێنم .. ب هنگو ئەزێ مەزنم د ناڤ ڤێ جيهانیدا ئەگەر هوين من بلند نەكەن ئەز دێ مەزناتیێ ل كيڤە ئينم ..؟!

**ژماره (١)** :ـ ئەزبەنی تە ئەم دڤێينو مە ژی تو دڤێی ..!

**ژماره (٢)** :ـ تو ژ مەیو يێ د ناڤ مەدا هەستایو تو سەروەرێ مەی ..

**ژماره (٣)** : ئەگەر رەوشتێ تە يێ باش نەبيت ئەم ژی تە وەسا بلند ناكەين

**ژماره (١)** : بشورەشگێر وەنەبێژە ... يێ چەوابيت هەر ئەو مەزنێ مەیه

**شورەشگێر ژماره (٣)** :ـ نەخێر ئەگەر مير ژ كومێ نەبيتو دگەل ژانو خوشیێت ملەتی نەبيت .. چ ميرەكەو نابيت سەروەرییێ بكەت .

**ژماره (٢)** :ـ مير هەر ميره .. يێ چەوا بيتو دەبيا هەمی گاڤا ئەم د فەرمانا ویدا بینو دەرنەكەڤين .

**شورەشگێر** :ـ نەخێر ئەو میرێ خوّل مللەتی بلندتر دکەت وژانا بو خەلکی پەیدا دکەت دەبیا میر نەبیت و نە مینیت .

**ژمارە (١)** :ـ بەسە ... بەسە .. میر هەر میرە و فەقیر ژی فەقیرە ..

**میر** :ـ خوّ تێك نەدەن .. ئەز بێ دگەل بیرو باوەرێت شورەشگێری‌دا ... ئەو میرێ نەشێت خزمەتا مللەتێ خوب چاکی بکەت و خو ژ وان بلندتر بکەت و بو پێشکەفتنا وان نەخەبتیت ئەو هێژای میراتیێ نی‌یەو نابیت میر بمینیت

**شورەشگێر** :ـ ئەزبەنی هوّسا توسەروەرێ مەی تا وی [illegible] یا تە مابیت و پێشکەفتیت .. بەلێ ئەگەر تول وێ دەوسێ دەرچوی ئەم  دەبیا تە نەنیاسین .

**میر** :ـ ئەو کەسێ خاریێ ل من ببینیت و نەبێژیت ئەو دوژمنێ منە ..!

**هەمی پێکفە** : بژی میر ... بژی میر .. بژی میر ...

«هەمی پێکفە دێ چنە دەرێ»

«ل دەمێ ئاخفتنا فی دیمەنەی «فاوست» دێ هێتە ژوّرو دێ گوهێ خوّ دەتە ئاخفتنێت وان ... بەلێ ئەووی نابینن ... تا دەمێ د چنە دەرێ روناهی دێ «فاوست»ی نیشان دەت ...»

**فاوست** :ـ ئەڤە چی‌یە .. چەوا دێ شێم فێ تەدارەکێ تێك دەم .. دەبیا ئەز رێکەکێ ببینمە ئەو هەمی تشتی بگوهرم .. بەلێ چەوا ...؟

«دێ چەند لوتا ل خوّ دەت و خوّ هەلافێژیت و بێژیت ...»

**فاوست** : من دیتەڤە .. دەبیا تشتەکێ وەسا بکەم کو ئاڤبەرا مللەتی و میری تێکدەم و پاشی ئەڤ تەدارەکە ب خو نامینیت ..!

«روناهی دێ بابا تاهیری نیشان دەت ل لایێ دیکەی شانوییێ»

**بابا تاهیر** :ـ وەریسێ درەوا بێ کورتە
دوژمنی چاکیێ بێ‌رەو شتە
هەر کەسێ رێکا خاریێ بگریت
بێ‌گومان دوماهی‌یا وی یا چەوتە

«ل فی دەمەی میر و هەڤالێت خو دێ هێنەڤە د ناڤ شانوێ‌دا»

**میر** :ـ من چو نەخوشی‌و دل ئێشی و بیرێت چەوتی نینە ... مللەتێ منێ بەختیـارە .. ئەڤە یە هیفی‌و ئومێدێت من .. بەلێ ل لەشێ خوّڤە ئەز کێمەکێ نەساخم ... ژانە سەرەکا تیژ ئەزێ گرتیم .. ئەگەر ئەڤ ژانە ل من نەمینیت ... ل وەلاتێ مندا گورگ و میهـ دێ پێکفە ژین و کەسێ هەوجەیەك نە ل خوّ نە ل مالا خوّ نە ل جیهێ خوّ نابیت .

«فاوست دێ هێتە ژوّر کو جل و بەرگێت نوژدارا بێ د کرینە بەرخوّ»

**فاوست «دێ گازی کەت»** :ـ نوژدارم و هەمی دەردا د برینم

نوژدارم و خوشیا ل دنێ ... ڤەدپەشینم
نوژدارم ..
ژانە سەرێ .. پشت ئێشانێ .. کێم خارنێ ..
کولك و کوڤانا ... هەمی دەردو ژانا
ب ڤان دەستا ..
ب خویندن و دەرمانا د بژکینم
نوژدارم .. نوژدارم ...
کێ هاریکاری دڤێت ..؟
کێ دەرمان و تیمارکرن دڤێت
کێ ژیانا خوش دڤێت
دێ ب ڤان دەستا بو ئینم ...
«میر دگەل هەڤالێت خو مژولێت ئاخفتنێ نە ..»
**هەڤالەکێ میری** : ئەزبەنی تە گوهـ ل ئاخفتنا ڤی مروڤەی هەیە ..؟!
**میر** :ـ بەلێ ... بەلێ ...؟!
**هەڤالەکێ دی** :ـ کی د بێژیت ئاخفتنا وی یاراستە ..؟
**میر** :ـ ما دا وی ژی تاقیکەینەڤە و بزانین درەوا دکەت یان ژی یێ راستە ..!؟
**هەڤالەك** :ـ ئەزبەنی گازی کەمێ ..؟!
**میر** : دێ گازی وی ژی بکەن ... ما چ ژێ چویە ..؟!
«فاوست دێ خو نێزیکی میریکەت و ب رێزڤە دێ هێتە پێش میری»
**فاوست** :ـ ئەزبەنی تە چ فەرمان هەیە دا خزمەتکاریێ تە بکەهینتە جهـ..؟!
**میر** :ـ ب خودێ نوژداری هێژا مە چو نەخوشی و نارحەتی نینن .. بەلێ ژانە سەرەکێ ئەزێ گرتیم و ل بەر ئێشێ ئەز ناتەبتم ..!
**فاوست** :ـ ئەزبەنی ژانە سەر نەخوشی یەکا گەلەکا ب ساناهی یە و خەمێ نەخو !
**میر** :ـ ڤێ ژانە سەرێ ئەزێ ل گار کریم و گەلەك شولێت پێتەڤی من بێ ناهێنە کرن ..!
**فاوست** :ـ میرێ من ... خەمێ نەخو .. تە چەوا دڤێت دێ وەسا بو تە چێکەم .
**میر** :ـ دێ فەرمو ... داخازا تە چی یە و چەوا دێ دەست پێکەین ...؟!
**فاوست** :ـ من چو نەڤێت و دەرمانێ تە ئەڤەیە د تویرکێ مندا ... بەلێ دەرمـانێ من مەرجەکێت دگەلدا دەبیا بێتە جیهێ خو ... نە وەك دێ خرابتربی ..؟!
**میر** : ئەگەر ئەڤ ژانە سەرە ل من بچیت ، تە چ مەرج هەنە هەمیا دێ بوتە ئینمە جێ ، تو من چێکەڤە ... خەمێ ل چو تشتا نەخو ..!!
**فاوست** :ـ ئەزبەنی ... میرێ من ... من مـالێ دونیایێ نـەڤێت .. من پایـەو تەخت

نەڤین ... مەرجێ من ئەوە .. دێ ب دەرمانێ من چێ بی‌یەڤە .. بەلێ هەر دەنگەکێ ل ڤی دەنگێ ئەم پێ د ئاخڤین زیدەتربوو هاتە گوهێت تە ... دێ هـوش‌و دەمارێت تـە گرژبن‌و تێک‌چن ... ل بەروێ هندێ ... دەبیا دەنگێت بلندو هەراو هاوارو قیژی ل ولاتی نەمینن ...!!

**هەڤالێت میری** :ـ بلا میرێ مە چێ‌ببیتەڤە ئەم وەناکەین نوقین ل جیهەکی بهێت ..!

**میر** : نە باب‌و نە چەوا دەنگێ ستران‌و لاڤژەو دەهوات‌و خوشی‌یا ، هەر وەسا دەنگێ گریان‌و خەمێ ل خەلکێ دەڤەرا خوڤەدەغەکەین ..؟

**هەڤالێت میری** : ئەزبەنی بلا تو چێ‌ببیەڤە بلا ئەو تشت مە نەمینن ...!!

**میر** : ئەڤ شولە یا ب زەحمەتە ..!

**فاوست** : نە خێر میرێ من وەسا نی‌یە .. خوشی‌و چاکی‌یا تە هیڤی‌یا هـەمی ڤی خەلکەیە !

**میر** : بەلێ وەسایە .. بەلێ من نەڤێت ئەز چوّنەخوشی‌یا بکەهینمە ولات‌و میللەتێ خو ..!

**فاوست** : ئەگەر توّیێ باش نەبی .. میللەت ژی دێ خراپ بیت ..!

**هەڤالێت میری** :ـ نوژدار راست دبێژیت ... بلا تە دەرمان بکەت ..!

**میر** : دێ باشە ..!

«فاوست تویرکێ خو دێ ڤەکەتەڤەو هیندەك قودی‌و شویشا دێ دەرئینیت‌و دێ دەرمانا ب سەریەکدا کەت‌و موسیقا ژی دێ دگەل کارێ «فاوستی» بەردەوام بیت‌و نیڤ بەرداغێ دەرمانەکی دێ چێ‌کەت‌و ل وی دەمی دا میرو هەڤالێت وی د سەتحینە ل کاری وی .. بەرداغێ دەرمانی دێ دەتەڤ میری‌و بێژیت :» .

فاوست : فەرموو میرم ڤەخو ب ناڤێ خودێ ...!

**هەڤالەکێ میری** : نەخێر .. دەبیا تو هندەکێ ژێ ڤەخوی پاشی میرێ مە دێ ڤەخوت ..

«فاوست ژی دێ قومەکێ ژ دەرمانێ خو ڤەخوت پاشی دێ دەتەڤ میری» ..

**میر «دێ ژێ وەرگریت و ڤەخوت»** :ـ ئای ... تەمە .. ئەڤـە چ بوو ..؟ مى بـوو ژ ماستی کێشای ... ئەڤ دەرمانە چ بوو ..؟ حەبیەکا ژانێ د سەرێ مندا نەما ..!!

**هەڤالێت میری** : «کرە قیری‌و هلوار» :بژیت نوژدارێ مە یێ نوی ..

**میر** : هەر چ دڤێت بدەنێ .

**فاوست** : ئەزبەنی من چو نەڤێت .. بەلێ ل پاش ماوەیەکێ کێم ئەو مەسەلا من گوّتی :ـ
دێ ل تە رووی دەت .. دێ ب دەنگی تێکچی ...!!

**هەڤالێت میری** : کەس ژ مە ب[illegible] دەنگێ ناکەت ..!

**فلوست** : تشتەکێ دیکە ژی یێ هەی ئەگەر میر تویرە بوو .. ئوگۆتی ڤی شولێ بکەن و منگۆ نەکر .. میر وەکی دڕرندا دێ لێ هێت و پاشی هەر چێ نابیتەڤە ..

**هەڤالێت میری** : ئەگەر میرێ مە ژیانا مە ژی بڤێت ئەم دێ دەینێ ..!

«فاوستی تشتێت خۆ لێك دان و خو ئامادەکر بو چوونێ»

**میر** : نوژدارێ دلوڤان ل دەڤ مەبە ، تە چ ل دونیایێ د ڤێت دێ بو تە ئینین ..!

**فلوست** : نەخێر ئەزبەنی .. من گەلەك نەخوشێت هەین و دێ چم و ل سەر گەریێم و ب ئانەهی یا خودێ دێ ڤەگەرێمەڤە جەم هەوە دابزانم میرێ هەوەی هێژا یێ چەوا یە ..؟!

**میرو هەڤالێت وی** : یاهێ .. یاهێ .. نوژدارێ دلوڤان .

**فلوست** : یاهێ ... یاهێ ..

**میر** : ئەڤە چ جورە نوژدار بوو .. خۆدێ ژیێ وی درێژکەت .. پا ب خودێ ب دەرمانێ ڤی نوژدارەی چێبوومەڤە ..

**هەڤالێت میری** : خودێ ژیێ وی درێژکەت .

**یەك ژ هەڤالێت میری** : میرێ من ... ئەڤە شیخ و حەکیم ژی هات .

«بابا تاهیر دێ هێتە د ناڤ شانوییێ دا» .

**بابا تاهیر** : دەمێت هەوە ب خێر بن میرێ من .

**میر** : هەی تو ب خێر هاتی زانایێ مەزن ... تو بۆ دیار نەبووی .. ما تو نزانی تو گەلەکێ پیروزی ل دەڤ مە ؟»

**بابا تاهیر** : ئەزبەنی ئەز مژولێ هیندەك مەسەلێت ڤێ دونیایێ بووم ..

**هەڤالەکێ میری** :ـ ئەزبەنی زاناو هێژایێ مە پا تە نەزانی کو نوژدارەکێ گەلەکێ چاك هاتبوو ئیرەو میرێ مە ل ژانە سەرا وی رزگارکرو چێکرەڤە ..!

**بابا تاهیر** : ئەو نوژدار یێ چەوا بوو ..؟!

**میر** : هەر نۆر ژێ د باری ... گەلەکێ پیروز بوو ..!

**بابا تاهیر** : ئەرێ هیچ مەرج دانان بو وەرگرتنا دەرمانی ؟

**هەڤالێت میری** : بەلێ .. بەلێ .. گۆتی میر دێ تویرە بیت ژ دەنگی ئەگەر چێ بووڤە ...!

**بابا تاهیر** : ئەی بێ ئولێ بێ ئول .. ئەو یا وی دڤیا کرو ب جێ ئینا ...!!

**میر** : ئەی مروڤێ پیروز .. تۆ چ د بێژی ... نوژدارەکە مروڤەکێ گەلەکێ پیروز دیاربۆو ..

**بابا تاهیر** : هوین وی بێ ئولی نەنیاسن .. مروڤێ خراپی و شولێت نارەوایە ... ئەز دناسم هوین وی نەنیاسن ..!

**میر** : ما وی چ ل مە دڤێت ..؟ مە چ خراپی یا وی کریە ..؟ بۆ چی دێ شولەکا وەسا

کەتکو زیان و زەرەرا بکەهینتە مە ...؟!

**بابا تاهیر** : میرێ من ... وی دیت کو ئەڤ ولاتە یێ د خوشیادا دژیت .. میرو گزیر وەکو یەکن ، کەسێ زیانێ ل کەسێ نادەت .. کەس ماف و حەقێ کەسێ ناخوت .. هەمی وەکو برا دژین .. ئەڤە ل جەم وی تشتەکێ گەلەکێ خراپ بوو .. وی نەدڤیا ئەڤ تشتە هەبیت و ئەڤ کارە پیس و چەپەلە ئەنجامدا ..!!

**میر** : وە نەبێژە سەیدا .. ئەو مروڤەکێ پیروزو دیاربوو ژانە سەرا من نەهێلا ..!

**بابا تاهیر** : میرێ من ... مەسەلە ئەو نی‌یە کو نهو ژانە سەرا تە نەما .. ئالوزی ئەوە کو دێ چێ ل دیڤرا هێت ...؟!

**میر** : هەر چ ببیت بلا ببیت .. ئەز ملەتێ خوب روح و گیانێ خو نادەم ...!

**بابا تاهیر** : دا ب بینین کا دێ چەوا بیت و دێ چ لێ هێت ...!

«روناهی دێ کز بیت»

«دەنگێ دەهول و زورناو

هندەك تولازو حجێل ، کچ و کور دێ هێنە د ناڤ شانـویێ‌داو دێ دەست ب دەهواتێ کەن .. میر دێ هێتە ژور دگەل هەڤالێت خو .. دێ تەماشای دەهواتێ کەن و میر دێ بێژیت :»

**میر** : یا ملەت هەر خوشی و شادی‌یا دا بیت .. ئەڤە هیڤی و نومیدا منە .

**هەڤالەکێ میری** : خودێ تە بوومە بهێلیت و ل هەمی نەخوشێت دونیایێ تە بپارێزیت ..

«میر ل پرداو بێ ئاگاهی‌یا خو هەوارەك راهێلاو گوتی :»

**میر** : بەسە .. بەسە .. ئەڤ دەنگە دێ سەرێ من پەقینیت !

**هەڤالێت وی** : ئەڤە چی‌یە ئەزبەنی ..؟ چ ل تەهات ..؟!

جحێل ،

میر ب تورەیی» .. د بێژمە هنگو ... ڤی دەنگەی راگرن .....!!

«هەڤالەکێ میری دێ فەرمانێ دەتە دەهول و زورنا کو بەتال‌کەن و چو دەنگ ژێ نەهێن»

«تولازەکێ زیرەك .. شورەشکێر ... دێ هێتە پێش میری و بێژیت»

**شورەشکێر** : ئەزبەنی چو یێ خراپ من نەگوتی‌بە .... دا زمانێ من ببری .. تە ئەم فێر نەکرینە کو ئەم تشتەکی د دلێ خودا بهێلین .... تە یێ گوتی‌یە مە هەرچی د دلێ هەوەدایە بێژن و نەڤەشێرن ..

**میر** : کربە .... ئەو روژ چو ...! وەرە سەربر . سەرێ ڤی کورەی ببرە ....!!

«سەربر دێ هێتە پێش بەلێ هەڤالەکێ میری دێ خو نێزیکی میری کەت و بێژیت

**هەڤالێ میری** : ئەزبەنی .... قوربان ..... ڤی بەلەنگازەی تشتەکێ خراپ نەگۆتی یە .
چەوا دێ تۆ سەرێ وی بڕی ....؟!
**میر** : کڕیە ئەڤە شولا تە نی یە ..... ئەو رۆژێت هەر کەسێ بوو خۆ چوون و نەمان ..!!
**هەڤالەکە** : من چو یێ خراپ نەگۆتی یە .؟
**میر** : سەربڕ وەرە سەرێ ڤی کەرەی ژی دگەل یێ دی ببڕە .. نهو ل پێش چاڤێت من
«بابا تاهیر دێ ل قولینجەکێ شانوییێ هێتە ژۆرو خۆ نێزیکی پێشی یا شانوییێ کەت»
**بابا تاهیر** : هەی خۆدێ کارێ تەراست نەئینیت .. مرۆڤێ خراپی یێ چوجارا نابیتە
زەلامێ چاکی یێ ... هەمی خوشیێت ڤی میللەتی تێکدان ..!!
«میر دگەل هەڤالێت خۆ و ئەو خەلکێ د ناڤ شانوییێدا د ئاخڤیت ..»
**میر** : بزانن دەنگەك من گۆهـ لێبیت ؟! ئەز یێ د خەویم ل بەر دەنگەکی هەستمەڤە ؟!
«ئەو کەسێ وی دەنگی ئەنجام ددەت هەمیا دێ سەر ژێ کەم !!
**هەڤالەکێ دی** : بەلێ قوربان . تە چۆ ئەمرێت دیکەنینە ....؟!
**میر** : ئەگەر هەر کەسەك ل سەر وان کەسێت ئەم سەر ژێ دکەین بگریت و هەوار بکەت
ئـەوانیش ل بازەری دەرکـەن و مێرێت وان بکـوژن و مالێت وان هـەرفینن و ویران
بکەن ..!
**هەڤالەکی دی** : ئەڤە ژی فەرمانە قوربان .؟
**میر** : بەلێ . فەرمانە . یاسایە . تێکەهێشتن .؟!
«روناکی دێ کز بیت»

فاوست و بابا تاهیر دێ هێنە ژۆرا شانوییێ داو نێزیك پێشیا شانوییێ»
**بابا تاهیر** : ئەی بێ ئول .. خودێ کارێ تە راست نەئینیت .. چەوا تە ئەڤ خوشی و
کەیف و شادی یە ل ڤی میللەتەی دوور ئێخستن .
**فاوست** : ئەی مرۆڤێ پیروز .. من نەگۆتە تە ئەزێ شێم هەمی چاکی یا ب هەرفینم و
رێکێت خراپی یێ ل بەر خەلکی ڤەکەم ..!!
**بابا تاهیر** : ئەی بێ مێشك ما تۆ نزانی رێکا خراپی یێ یا درێـژ نی یە و وەریسێ درەو
دەلەسا یێ کورتە ..!!
**فاوست** : ئەو یا من دڤێت دێ کەم .. ئەگەر تۆ ژی یێ زیرەك بی .. کارێت من تێکدە ..!
**بابا تاهیر** : رێ یا راستی یێ .. رێکا مروڤاتی یێ . رێکا چاکی یێ د ئاشکرانە . ئەگـەر
خەلك خۆ بدەنێ بێ گومان دێ ب سەرکەڤن و هەموو پیلانێت تە دێ د بێ سود بن .
**فاوست** : تۆ بو خو هەر ڤێ زورنایێ لێدە .. دێ بینی کا دێ چەوا بیت .
«فاوست و بابا تاهیر یێ ل پێشیا شـانویێ و شـانویـا تاری یـە . پاشی دێ بیتە

روناهی .. میرو هەڤالێت وی کو هەمیا چەکێت ب ملاڤەو هەمی د توندو توستن»
میر : ئەو مرۆڤێت دەنگ ژ مالا وان هاتیو بو کوری خو گرین هنگو چ لێ کرن ..؟
هەڤالەکێ وی : ئەزبەنی مە ل بازەری کرنە دەریٔ و تشتێ وان تالان کرو ، خانێت وان
هەمی هەرفاندن ..!
میر : باشە .. دا کەس نەشێت ل فەرمانێت من دەربچێت ... نە وەك ئەڤەیە دوماهی‌یا
وی ...
هەڤالێت وی : بەلێ قوربان .. بەلێ ئەزبەنی . فەرمانێت تە یاسانە ..!
«میرو هەڤالێت وی دێ دەرچن و روناهی‌یا شانویێ دێ کز بیت . پاش دێ روهن
بیتەڤە کو ژنەك‌و مێرەك و چەند زاروکێت وان د نڤستینە کچەك «دێ ل خەو رابیتەڤەو
هەوار کەت» . هێ . ماری . هێ ماری .. ماری ئەز خارم ....!!
«دەیك‌و باب‌و خوشك‌و براێت وێ دێ هەستنەڤە .. دێ بیتە هات‌و هاوار دێ دارا
ب عەردی دادەن‌و کەنە هەوار ..»
ـ : خلاس نەکەن بکوژن ..!
ـ : بەزر نەبیت ، نەهێلن برەڤیت .!
ـ : بکوژن .. بکوژن ...!
ـ : گازی جیرانا بکەن .. دا هاری کاری‌یا مە بکەن
ـ : ئەڤ مارە .. زوری زەبەلحە ...!
«هندەك مروڤ بجلکێت نڤستنێ دێ هێنە د ناڤ شانویێ دا . گوپال‌و مەربێل‌و
دارێت د دەستی‌داو دێ کەنە هەوار .»
ـ : بکوژن . بکوژن ..!
ـ : هوشیاربن .. پێ بریندارە .. نە وەك ب یەکی ل هنگو ڤەبدەت .!
ـ : دێ لێ دەن ب بێرکا ، ب دارا .. مەربێلا . ب گوپالا ..!
ـ : بزانن چەوا پێ کیفیا را د هێلیت ..
ـ : بکوژن . بکوژن ....!
ـ : دارەکێ ل سەری بدەن . دەبیا سەرێ وی بهێتە پەڤاندن نە وەك نامریت ..
ـ : لێدەن .. لێدەن .!
ـ : های عافرەرین ئازادی گوپالەك ل سەری داو مارەکە کەت ..!
ـ : دێ سەرێ وی ب پەرچقینن .. دا رانەبیتەڤە .
ـ : ئێ . ئێ سوپاس بو خودێ کو ئەم شیاین ڤی زرە مارەی بکوژین .
ـ : خودێ کر ب چو زاروکا ڤەنەدا .. نە وەك ئاڤ ڤێرا نە دگەهشت ...!
ـ : مارەکە کورە ماربوو ....... لەڤا وی‌و ترپ یەکن .!

«ل وی دەمی زڕتەکێت میری ب چەکڤە دێ هێنە د ناڤ شانوێ‌دا»

**سەروکێ زڕتەکا** : ئەڤە کی خوٚ ل سەربوو دەنگێ خودەرئینای .!

**خودانێ مالێ** : ئەزبەنی ئەم بووین ..!

**سەروکێ زڕتەکا** : ما هوین نزانن میری دەنگێت قەدەغەکرین .

**خودانێ مالێ** : برایێ من . دێ ب بینە ئەڤە مارەو ب ماری کاری یا جیرانا مـە یێ کوشتی نە خوٚدا مە خەلاس‌کەت !...

**سەروکێ زڕتەکا** : کی دبێژیت هنگوٚ ئەڤ مارە نهو یێ کوشتی . بەلکو ئەڤ رەفتارا هنگوٚل بەر وێ هندێ بیت‌دا فەرمان‌و یاساییێت میری ل عەردی بدەن .

**خودانێ مالێ** : خودێ ژ تە رازی . ما تو نابینی خونیا ماری هێشتا هیشك نەبی‌یە . ئەڤە عەردو ئەڤە دیوار .. شوینا دارو بێرك‌و مەربێلا یا دیارە . بوٚ تو باوەر ناکەی ..؟!

**سەروکێ زڕتەکا** : ئەز نزانم . باوەر ناکەم .. باوەری‌یا من چو بها نی‌یە . دەبیا میر باوەر بکەت ..!

«سەروکێ زڕتەکا دگەل هەڤالێت خو دێ خودانێ مالێ بەن‌و چنە دەرێ .

«روناهی‌یا شانوییێ دێ کز بیت»

«روناهی‌یا شانوییێ دێ رەوشەنبیت و میرو هەڤالێت وی د روینشتی‌نە»

**میر** :ـ هوین د بێژن ئەو دەنگ ل کیڤە دهاتن‌و بوٚ چێ بوون ..؟!

**هەڤالێت میری** : نهو زڕتەکێت مە دێ ئاشکراکەن‌و زانن مەسەلە چی‌بە .؟!

«سەروکێ زڕتەکا .. دگەل هەڤالێت خوٚکو خودانێ مالێ یێ ب جلکێت نفستنێ د پێش خوٚدا پال ددەن دێ هێنە د ناڤ شانوییێ‌دا .»

**سەروکێ زڕتەکا** :ـ ئەزبەنی میر ئەو دەنگو هەوار ل مالا ڤی مروٚڤەی‌دا بوون ..!

**میر** : کورو بێ مێشك تو نزانی مە دەنگو هەوار یێ د قەدەغەکرین .؟

**خودانێ مالێ** : ئەزبەنێ ئەم بو خو د نفستی بووین . کچەکا گەمالوك مە یا هەی ب گری‌و هەوارڤە ل خەو هەستاو گوٚتی : ماری ئەز خارم ... ل بەر وێ هندێ ئەم هەمی هەستاینەڤەو مە کرە هەوارو جیرانێت مە هاتن تا مە مار گوشت ...

**میر** : کی د بێژیت هنگو مار نهو یێ کوشتی .؟!

**خودانێ مالێ** : مار یێ ل مالا مەو خوینا وی هیشتا یا گەرمە .!

**میر** : کوٚرو ئەتو .. «دێ ئیشارەتێ بو زڕتەکەکی کـەت» هەرە مـارەکە بینـە .. ئیرە دابزانین وەیە ..... یان ژی درەوا دکەت ..!!

**زڕتەکە** : بەلێ قوربان :ـ «دێ کەتە غارو ل شانوییێ دەرچیت .....»

**میر** : کورو ئەگەر وەسا نەبیت تو دزانی دێ چ ل تەکەم ؟!

**خودانێ مالێ** : ئەزبەنی تو میری مەی‌وتو هەرچی دبیژی ل سەر سەری مەیەوِدیِ ب جی ئینین .!
**میر** : ئەو رۆژچۆن کو هەر کەسەك ب کەیفا خو شولا بکەت .. هەمی فەرمان فەرماننێت منن .. هەر چ ئەز دبێژم ئەو دەبیا بکەهیتە ئەنجام‌و هیچی تر ...
«ل وی دەمی زرتەکەکـە دێ هێتە ژۆر کـو مارەکێ‌پنی پی‌وستـویریێ‌ل سـەر دارەکی هەلگرتی‌و ئینا ژۆر ....»
**زرتەکە** : ئەزبەنی . میرێ من .. ئەڤەیە مارەکە ..!
«میرۆ هەڤالێت وی دێ هێنە نێزیك‌و مـیر ب دارێ د دەستێ وی‌دا دێ ماری وەرگێریت‌و داگێریت ...»
**میر** : باشە . باشە .. ئەڤە مارە .. بەلێ بەلکو ئەڤە ل جیهاکێ دی هاتبیتە کوشتن و هنگۆ ئینابیتە د ناڤ مالا خۆداو کربیتە هات‌و هەوار .. بو وێ هندێ کو فەرمان‌و یاسایێت من بشکێنن ..
**خودانێ مالێ** : ئەزبەنێ جیهێ مە مار لێ کوشتی‌و جیهێ خوینا وی خلخلاندی و ئاخا دیوار یا دیارە ئەزبەنی . ما دێ چەو درەوا ل حوزورا جەنابێ تە کەین .. قوربان .!
**میر** : ئەڤە ناچیتە د مێشکێ مندا بەلێ دەبیا ئەز بخو بچم‌و وی جیهی ببینم .... نە وەك ئەز باوەر ناکەم ....
«روناهی‌یا شانوییێ دێ کزبیت و پاش دی روناهی هێتەڤە کو شانو مالا کابرایە .. دەیك‌و زاروك یێ د ناڤ شانوییێ‌دا درونیشێنە زرتەکێت میری دێ هێنە ژۆرێ و پاشی خودانێ مالێ و ل دیڤدا میرو هەڤالێت خو دێ هێنە ژۆر »
**میر** : کا دێ نیشا من بدەن مار ل کیڤە بوو ..؟
**خودانێ مالێ** : ئەزبەنێ ئەڤ کچا من ل ڤێرە یا نفستی‌بوو ل دەمێ هەستایەڤەو کریە قیژی‌و گۆتی ! ماری ئەز خارم ..
**میر** : باشە مار ل کیڤە هاتی‌یە د ناڤ مالا هەوەدا ..؟
**خودانێ مالێ** : ئەزبەنی ما ئەز چـۆ زانم دویر نی‌یـە ل بانی کـەتبیت یان ژی ل بن دەرگەهی هاتبیتە ژۆر .. یان ژی د ناڤ کۆنەکێ‌و ل مالێ هاتبیتە دەرێ . ما ئەز چو زانم ئەزبەنی ..؟!
**میر** : نەخێر دەبیا بزانێ ...؟!
**خودانێ میرێ** : کۆرو تۆ بۆ هندە یێ بێ مێشکی و ل بەر دەڤێ میری د دەیەڤە .؟
**خودانێ مالێ** : ئەزبەنی میر یێ ژ من د پرسیت‌و ئەزێ پەرسڤا وی د دەمەڤە
**میر** : ژێ بگەرێ باشە زەلام کا جیهێ کوشتنا ماری ....؟!
**خودانێ مالێ** : ب بینە ئەزبەنی . مار هێڤە هات‌و بو ڤی لایەی چو و گەریاڤە ڤی لایەی

وكيفه كيف د كر من و جيرانێت مه ب دارو گوپال و بێرك و مه ربێلا مه لێ داو كوشت .

مير : كانێ ل كيفه ..؟!

خودانێ مالێ ها ئه زبه نی .. ئه ڤه جێ دارایه .. ئه ڤه جیهێ بێرکێ یه .. ئه ڤه یێ گوپالایه .. لایێ هه نێ مه ربێلا ڤێ كه تی . ها ئه ڤه خونیا ماری یه . ئه ڤه ژی پارچه كا سه رێ وی یه یا ل ڤێره مایه ڤه ...!

مير : وه سایه .. ئه ڤه دیار بوو كو قه له بالغا هه وه یا كوشتنا ماری بوو .. به لێ هوین نزانن كو هه وارو ده نگ بلندكرن قه ده غه یه ...؟

خودانێ مالێ :ـ ئه زبه نی . مار بوو زاروكیش به رامبه ر ماری چ بكه ن ؟ مار دوژمنه ......!

مير : نه خێر هوین دا شێن بێ قه له بالغ و ده نگ بلندی ماره كه ی بكوژن و ئێنیش ناره حه ت نه كه ن و فه رمان و یاسایێت من نه شكێنن .....!!

خودانێ مالێ : چه وا ئه زبه نی ..... ماربوو ... مار دوژمنه .. زاروك ترسیان و كره هه وار ...!

مير : «ب توره یی» نه دبوو هوین بكه نه قه له بالغ و هه وار ، ما هوین فه رمانێت من نزانن ...؟

خودانێ مالێ : به لێ قوربان .. به لێ مروڤ دێ چ ل زاروكا كه ت .....؟!

مير : ئه گه ر نهو زاروك ل فه رمانێت من ده ربچن پا ئه گه ر مه زن بوون دێ چ كه ن ...؟

خودانێ مالێ : ئه زبه نی . قوربان .. ئه زو زاروكێت خو قوربانی ته ببین ... چ فه رمانه كێ بكه ی ئه م دراوه ستاینه .....!

مير : «دێ كازی كه ته هه ڤال و زرته كێت خو» :ـ وه رن .. ل به ر كوشتنا ماری بوون و مه زانی ئه و تشت یێ راسته ... ل به ر وێ هندێ فه رمانا سه ربرنیا كه سێ ل ڤێ مالێ نادەین . لێ پا ئه و د شیان ب بێ ده نگی و وی ماری بكوژن و وێ قه له بالغێ نه كه ن دا ئه ز توره یم و سه رێ من ب ئێشیت . ل به ر ڤێ هندێ ده بیا خودانێ مالێ د گه ل زاروك و هه می جیرانێت خو ل بازه رێ مه ده ركه ڤن و خانێت وان بهه رفینن و ویران كه ن دا قوتابخانه كا فێركرنا بێ ده نگی ی ل جیهێ مالێت وان ئاڤاكه ن .....!

«شانو ب هه می ڤه دێ تاری بیت و روناهی یا هولێ دێ هێته ڤه ...»

١٩٨٧ ـ ٨ ـ ٨

# بـــه يـــتـــا كيـّچـــا

* عبد الرحمن طيب بامرنى*

بیٚ گومان توریٚ مه یێ کوردی چ گـول نه هێلاینه لناڤ باخچیٚ خو نه چاندین ، و چ هه ڤش نه هێلاینه په زیٚ خو لیٚ چه راندی، هه ر وه کی هه می که س دزانن توریٚ مه یێ کوردی چ پلا ژ تورێت بیانی کێم تر نینه و چ گول دناڤ چ باخچا را نه هێلانیه هه که بێهن نه کربیتیٚ ...

ڤێجا براینو ئه م ژی دیٚ ڤیٚ گـولیٚ ژ باخچیٚ توریٚ کوردی که ین و دیٚ پێش کێشی هه وه که ین هه ر چه نده ئه م نزانین کو ناڤیٚ وی که سی چی یه ئه ویٚ ئه ڤ گـولا هو یا جوان دناڤ باخچیٚ توریٚ کوردی دا چاندی ، بتنیٚ یا ئه م دزانین گوله کا گه له کـا هێژایـه و خـه لکـیٚ د کێشیته خو ، و بێهنه کا گه له کا خوش ژیٚ دهێتن ...

و ئه ڤ گولا هو یا جوان و بێهن خوش به یته کـا کێچایه و یا بکێچا هاتی یه گوتن ، کو هه ر جمه کـیٚ مروڤ بچیتیٚ و بره ڤیتیٚ کێچ هه ر بیٚ بدویف مروڤی ڤه ...

و نه خاسمــه هه كه مروڤ ڤئ به يتئ بخوينيت و هزره‌كـا كوير تيْدا بكه ت ، دئ گه له ک تاژئ چـن و دئ گه‌له‌ک رامانا ده ت، و دئ ناڤئ خودانئ وئ ژى نيْزيک كه ت...

لبه راهيئ ئه م دئ خو به رده نيه دناڤ ڤئ به يتئ دا كا ئه م چ به لـگا نابينين ناڤئ خودانئ به يتئ ديـار كه ين ...

لدويڤ خواندنا مالكيْــت به يتئ و گه ريانا هوزانڤانى هه مى لره خ و دوريْت گوندئ بامه رنئ نه وه كى ڤان گوندا - دوكه رئ - ئاڤا مه زن - هه مزا - هه سن پيركا - باسه رنئ - ئه ره دنا - به رواريا - ئوره - راڤينا - ...

و لدويڤ بو چودنا به يتـئ بخو دبيت يا حوسنى بامه رنى بيت به لئ مه چ به لگه نينن كو بيْژت يا حوسنى يه ... يا دووئ لدويڤ چودنا رامانا به يتئ يه .

هوزانڤانئ مه گه له ک بئ زيره كه د ڤـه هاندنئ دا و هزره كا گه له كا جوان يا دسه رئ وى دا لڤلڤـــى ... چنكو وى يا ديار كرى هه كه مروڤ هزره كئ ژ كيْچئ بكه ت و ژ كيْچئ بترسيت و كيْچ هند يا بچويک كو مروڤ چ هزرا بو نه كه ت ، هه تا كو له شئ مروڤى حرئ دكه ته پرسک ، پا مروڤ بو مرنئ چ بيْژيت، و هه كومروڤ دمريت و دچيته به ر ئه مرئ خودئ ته عالا .. مروڤ دئ چاوا به رسڤا وى ده ت و بكيژ ره نگى يان ، هه كو مروڤى

کفن دکه ت و مروڤی دکه نه دوی قه بری ره ش و
تاری دا و نه که س لده ڤ مروڤی ...

« به یتا کیڕچا »

گه لی خویشک و برا
حازر بن لڤان درا
هه لکه ن شه مال و چرا
گوه بده ن به یتا کیڕچا
جاره کێ چوومه کاروانی
جوومه ماله کێ بمیهڤانی
چه ند کیڕچیت گوندی هاتن خانی
حه رام بیت هه که وه کری بخوم نانی

ژ ویرێ ره ڤیم چوومه دوکه رێ
کیڕچیت کوم بوین لسه ر بیڕده رێ
نیکلێ وان تیژه وه ک خه نجه رێ
ئه ز ژو یرێ ژی کرمه ده رێ

ژ ویرێ هاتم سه ر ئاڤا مه زن
به رێ خو ده مێ کیڕچیت د دویڤ من دا دبه زن
شاخیڕت وان لبه ر من بو نه بزت

ژ ویریٚ هاتم هه‌مزا مالا ناغایی
کێچا لسه‌ر من کره تبایی
حه‌رام بیت هه‌که من پالا خودایی
ژ ویری هاتم هه‌سن پیرکا
وه‌فدێت کێچا کوم بوت لبن تهیرکا
به‌ردا بدویڤ من ڤه هه‌تا سه‌ریٚ زیرکا

ژ ویریٚ زڤریم بامه‌رنیٚ
کێچا خودا گلکه نیٚ
وه‌عده بی زادی نه‌خوی ژ له‌گه‌نیٚ

ژ ویریٚ چوومه ئه‌ره‌دنا
کێچێت سویند خون بمال و ژنا
ئه‌م وه‌نه‌که‌ین بچی یه‌ چ شکه‌فت و کونا

چوومه ناف به‌رواریا
کێچێت دکه‌ن یاریا ..
به‌ریٚ من دا هه‌کاریا
ژ ویریٚ چوومه ئوره

من دیت کێچێت وان گه‌ له‌ ک بیٚ توره
هه‌ چیا من گوتیٚ چاوانی
د گوته‌ من زوی بوره

پاشی چوومه‌ مالا بیتاری
من پالا خو دا دیواری
کێچا دگه‌ ل من کر نه‌ یاری

چوومه‌ ئورسانو راڤینا
کێچێت سویند دخون جه‌ می دینا
تو نا نڤی لناڤ نڤینا

ئه‌ ڤه‌ هه‌ می مه‌ گوتن لسه‌ ر دنیٚ
ژبه‌ ر کێحا
پا تو ج دبی ی بو مرنیٚ
وه‌ ختیٚ مروڤ لکفنی دپێچا

و مروڤ که‌ ن دقه‌ بری دا .
ه ده‌ ن بـ ر ئارپێچا

ڤێجا برانیو هوزا نفایت مه‌ چ کانیک نه‌ هێلاینه‌مستا

خو لیْ نه دای و هنده ک ئاف ژیْ نەڤه خاری ...
هه ر وه کی هوزا نڤانه کیْ بیْ دی ئه ڤ مالکا
هوزانیْ ڤه هاندی ...

مریشک و میْش
قه ره چ و پیْش
طه ریْفن ئو د دل ئیش
هندی مروڤ پاژوت
ئه و دیْ هه ر هیْن پیْش
یان ئه ڤ مالکا ژیْری ئه ڤا ب ریڤی بیْت فیْلباز
هاتی یه ڤه هاندن ...

هه ر یڤی ریڤی
سه باب خودانیْ کیڤی
چ حنیْر کر ل نشیڤی

ڤیْجا برانیو هوزانڤانیْت مه دوو چویچک بئیْک به رک
کوشتینه ، چویچکا ئیْکیْ ، رامانه کا تایبه تی یا ددلیْ وی
دا ویا دیار کری و یا دوویْ ، بترانکـی هـوزانیْت خـو
نڤیْسی نه دا خویْنده ڤان بخو زه وقه کیْ ژیْ بینیت ...

تیبینی :-

من ئەڤ بەیتا کێچا و هەردوو مالکێت دی ژ زار دەڤێ

مەلە طیب وەرگرتینە کو بابێ منە .. و بابێ من خەلکێ گوندێ بامەزنێ یە و نوکە ژی ئاکنجی یە ل دهوکا داسننیا ...

وئەڤ بەیتە ل.١ - ٤ - ١٩٨٧ من نڤیسی بەو ژ هینگێ وەرە لدەف منە و داخازا من بەلکی ئەز بسەرو کانیا وێ جوکا هویا زەلال بکەڤم

..عبد الرحمن طیب احمد

اتحاد ادباء الاكراد /

# شانۆنامەی یەک پەردە

*غفور صالح عبد الله*

مەمەند

یان

ئەودیوی کارەسات

* * *

کارەکتەرەکان

xxxxxxxxxx

* بەیت بێژ
* مەمەند
* خاڵە هیمەت
* چاورەش
* عەولە خێل
* سێ منداڵ
* چەند کەسێکی تر

. . .

( شانۆ تاریکە ، زەلی و بوڵەی کۆمەڵە ژن و پیاوێک ذیت بانگی منداڵەکانیان دەکەن )

ده نگه کان : مه مه نده شێت واز له مناڵه کان بێنه ، سه ر گورشته ی پرپووچیان بۆ مه گێڕه وه ، . مه مه نده شێت . . مه مه نده
شێر ... شی ، شی ،،
ده نگی مناڵان : ده ی مه مه ند گیان ،گۆرانیه که ی وه یسه و چاوره شمان بۆ بڵێ ..
ده نگه کان : هه تیوونه ، گوجیله سه گینه، به س دووای کلاوی بابردوو بکه ون .
ده نگی مناڵان : نا دایکان ، نا باوکان ، تو خوا ده به مه مه ند بلێین با گۆرانی وه یسه و چاوره شمان بۆ بڵێ ..
ده نگه کان: هه تیوونیه ، گوجیله سه گینه ، به س دووای کلاوی بابردوو بکه ون . .
ده نگێکی تر : ئه گه ر کلاوتان به ر «با» که وت خوتان به ر شه قی ده ن ، تا چاکتر « با » ده یبات ..
(هه موو ده نگه کان تێکه ڵ ده بن )
(به له تیشکێک ده که وێته سه ر به یت بێژ له سووچێکی شانۆوه )
به یت بێژ : (هه ر خۆیشی ده وری مه مه ند ده بینێ ) بێ ده نگک بن ، خه ڵکینه بێ ده نگک بن ... ئه م گونده ی مه مه ند ده شێ به گشت واتایه که وه گوند نه بێ ، له وانه یه شارێک بێت ، یان کیشوه رێک ، یان وولاتێک بێت . ئێمه ش به گوندی داده بنێین له به رئه وه ی رووداوه کان به سفتی و چروپری و تێکسمراویه وه شوێن ره وتی خۆیان بکه ون ، هه روه کو نیگارێکی ته شکیلی له چوارچێوه که ی دا خۆی بنوێنێ. ئه گه ر ئه م گونده له سه ر له ته کاغزێک ئه خشه ی بکێشین ، ئه وا یه کسه ر له وێنه ی مارێکی کوڵه پنه ی ئه ستوور ده چێ ..
(ده نگی قاسپه قاسپی ره وه که وێک )
به یت بێژ : ( زه رده خه نه یه ک ده یگرێ و هه ناسه یه ک هه ڵده کێشێ )
گونده ی مه مه ند ، کۆمه ڵه شاخێکی سه خت و سه رکه ش له دووروو نزیکه وه گورینچه یان داوه .. بگره ته نانه ت هه ندێک له خانوویه ره کانیش که وتوونه ته سه ر لوتکه و پاڵ و هه ڵدێره کانه وه ، یاخود به لاپاڵ و لێواره کانیه وه شۆڕ بوونه ته وه (وێسکێک ده کا ) ئه و خانوویه رانه ش به چه ند تووله رێگای سه ختی ئێچاوێچ به یه که وه لکاون .. دوو رووباریش گونده که ی مه مه ند ده که نه سێ به شه وه ..
یه که م رووبار له رۆژهه لاتیه وه هه ڵده قوڵێ ، که سه رچاوه که شی چه ند وورده کانیاوێکی ژێر که پکه شاخه کانه .. رووباره که ی تریش له رۆژئاوای باکووریه وه له دووتوێی چیا هه زار به هه زاره کانه وه هه ڵده قوڵێ (ده نگی خوره ی ئاو دێت، ه یت بێژ به هه ردوو ده ستی وه کو بیه وێ رووخساری بشوزێ ، سه روچاوی خۆی داده پۆشێ ،

له پاشان هه ناسه یه کی سارد هه لده کیشی ) هه ردوو رووباره که ش به چه ند جوگه له یه ک به نێو گونده که ی مه مه ندا پـه ل په ل ده بنه وه .. پاینه ئـاوی جوگاکانیش له گه لْ خوێیان دا ده ردو که سه رو هه زاران دلْشکاوی و ئه ڤین و ئه شقباری و ناله ی برسیه تی خـه لْکی گوندده که راپێچ ده نکه ن . به سه رانسـه ری زه ریـاو ئوقیانووسه کانـی جیهان دا ده نـگێرن .. ( وێنسکێنـک ده کـات ،ده کـویلیْ سلْ لـه شتێک ده کاته وه ، ئاورِی ئه م لاو لای خوێی ده داته وه .. ئوخژنێک هه لده کێشیْ ) ئه وه ی دانیشتووانی گونده که ی مه مه نده ، زورِبه ی جووتیارو پاله و شوان و گاوانن ، بـه شێکی کـه میان به پینه دوزی و کلاش چنیـن و کریْ گرتـه بیـه وه خه ریکن ( وێنستێک) .. مێژووی دامه زراندنی ئـه م گوندده زوّر کوتـه ، یـاخود زوّر نهێنیه و دوژمنه کانی خه لْکه که ی ده خن نه گومان و پارِایه وه .. هه ندیْ ده لێن : چه ند هه زار سالێک به ر له دایک بوونی مه سیح بره خێلْێکی کوچه ری دروستیان کردوه ، که ئـه وانیـش له ده ورهبـه رێـکی دوورِا خـوێیان گه یاندوه تـه ئێره ..گه رچـی لـه دێرزه مانیشه وه تووشی گه لێک وه یشوومه ی روژ گار هاتووه .سه دان جار له ژێر نالی ئه سپی روْمه کان دا پلیشا وه ته وه ، یان له لایه ن بنه چه کی - کورش - ه وه ژێرو ژوو کراوه ، ته نانه ت هولاکوێش خوێی پیْ تاقی کروته وه . به لاْم ئه م له روژگار زوّر چاوقایم تر بوو .. هه ر به ئاوه دانـی ماوه ته وه ، خه لْکه که یشی هـه زاران وه چه و نه وه یان خستوته وه و باوباپیرانی خوێیان ـ یادنه کردووه

(تاریکی )

مه مه ند : (رووناکی ده خرێته سه ر، پالیْ لیْ داوه تـه وه ، شـره وبره ی لـه بـه ره ، جه مه دانیه که ی له ده وری ملی ئالاْنوون، وه کویلیْ ی رووی ده می کردوته که سێک. یان کومه لی که سێک و گورانی ده لیْ ) :

ئاسکه کان گه رمیان به ر به ره لاْیه
وه یسه کوزراوه و ده نگک برنه و نایه
له وساکه وه چاوه ره ش بوْ سه رکانی و ئاو
ده نگی شه ده و له لنجه و لاری نایه ..
به گوزی وه یسه سوێندی خواردوون
تاوه وکو تێکرای نه وجه وانانی گوند
توْله ی نه که نه وه له گشت شوْرباخوْرو ئاغایه

(رووناکی ده خرێته سه ر چاوره ش ، له سووچێکی شانوکه دا هه لْس وکه وتی شێتانه ده کات )

بۆ لاوێکی تر سوومای چاوانی هه ڵنایه .
ئای بۆ خۆم ، بۆ سوارچاکی مه یدان
بۆ پڵنگ و به چکه شێری کێوان
بۆ سه رو مشکی ی له خوێن گه وزاو
بۆ لاشه ی بێ سه رو شوێن نیژراو
(چاوره ش وون ده بێ ، خاڵه هیمه ت لـه جێگاکه ی ئه و په یاده بێ ، رووناکی ده خرێته سه ر ) .
خاڵه هیمه ت : (گۆپاڵێکی به ده سته وه یه و ، خۆی داداوه ته سه ربه وه )
مه مه ند به یانیت به خێر (مه مه ند راده چه نێ و ئاوڕی
لێ ده داته وه و، به پێ بایه خیه وه سه ر داده نه وێنێ )
چییه ده لێ ی دیسان دڵته نگی پرزه ی لێت بڕیوه ،
گوێم له ده نگی گوزرانیت بوو . ؟!
مه مه ند : (به کزیه وه ) خاڵه هیمه ت به خێر هاتی . .
چی بکه م مه گه ر
جاروبار به گوزرانی ده ردو که سه ری ده روو نم به با بده م . . به خێر هاتی ، به چاوان .
خاڵه هیمه ت : مه مه ند ، ده نگک خۆشیه کـه ی جاخی جارانت هه رماوه ، و .
خۆزگه م به و رۆژانه ی که هێشتا - خه زاڵ - له ئارادا بوو ، هه موو
رۆژێ بـه ده نگـه خۆش خوانه که ت به یتی وه یسه و چاوره شت بۆ
ده گێڕاینه وه ( ئاهێنگ هه ڵده کێشێ ) حه زم لـه چایه کی خه لیسی
به یانیانی ده ستت ده که م .. ئه گه رچی هه ن چای ده ستت ناخۆته وه ،
ئای بۆ ئه و رۆژانه ی کـه تۆ که لـه مێردی گوند بـووی و ، هه رده م
چایخانه کـه ت سیخناخ بـوو .. ئه مێستاش شێتی بێ سه رو شوێنی
خه زاڵی .
مه مه ند : له وانـه یـه ده رگاری چایخانه که ش مۆرکـه م . ئه ونجا ده م بـگرینه
قوته وه ، تا به هیمه تی مشایه خ و پیاوچاکان ده رگای بـه زه ییمان
لێ بکرێته وه . .
خاڵه هیمه ت :( ده نگی تێکدانی چای دێت ) دیسان چی قه وماوه مه مه ند ..؟
یان شتێک بووه ؟ یان ئه وه تا وه رز بووی و دیسان ده تـه وێ

سه ری خوت هه لگری . ؟ ! ( ویستینک ) دیسان نه خه ڵه تابی
وابکه ی . . چونکه سه رشێتی ئاوها په ژیوانی له دووایه . . توو
ئه م گونده جمکن ، به بیٚ یه ک هه ڵناکه ن ( به گوێڵه که ی خه ت
له زه وی ده کێشتی ) ته نانه ت ته یرو تووریش هه ر بوٚ
جێگایه ده گه ڕێته وه کــه یه که مجار تێدا سه ری له هێلکه
جووقاوه . .

مه مه ند : ( به هه ناسه ساردیه وه چ زه وی و خاکێک هه یه بسه رگه ردانی و
سه رهه لگرتنم له ئامێز بگریٚ . . ؟ چ زه وی و خاکێک ده توانیٚ
هاژه ی رق و تووڕه ییم بگرێته خوٚی ؟ چ گوندێک هه یه له سه ر
رووی زه وی ، وه کو ئه م گونده قه تماغه ی برینه کوٚن و نوێیه
کانم سارێژ کات ؟ چ ئاوو هه وایه ک ده توانیٚ سنگی پڕ
ده ردو که سه رم ئاسووده کات . . ؟ ( بیٚ ده نگی ) . به لاٚم .
دوای خه زاڵ ئوٚقره م له به ر براوه ، به خوٚم ناگرم ، وه کو بلٚیٚ ی
یه کێک پێم ده لیٚ هێشتا خه زاڵ ماوه و ده بیٚ بوٚی بـکه و مـه
گه ڕان . .

خاڵه هیمه ت : کوڕم مه مه ند ، داساکیٚ ، چی ده کـه ی ، ئـه مه چاره نووس
ئاخوٚ به ره و کو ێمان ده بات ، بره ک پشووق هه بیٚ . .

مه مه ند : خاڵی هیمه ت ، توٚش ته نها کوٚمه ڵێک بیره وه ری و سه رگورشته ی ،
ده سه پاچه یت و هیچت بوٚ ناکریٚ . . هه رکه داده نیشی ده بیته
سه رگورشته ی کاره ساتی جه رگبڕو پیاوکوشتن و ماڵ وێرانی ی . .
له دلٚی خوت دا ناوی کوٚمه ڵێ سوارچاک و جه وامێرو که له
مێردت شاردوٚته وه . بیٚ ئه وه ی شتیٚ ئه نجام بده ی . توٚش ته نها
به فرمێسک که سه ری ده روونت ده شوٚیته وه . .

خاڵی هیمه ت :( به ته وه سه وه ) ئه وه ی من دیومه سه ری منالٚی به ر مه مکه
وسپی ده کا . . به کو له مه رگی ی گه یشتمه ئێستاکه( ئاهێک
هه ڵده کێشیٚ ) کوڕم به خوای زوٚر له خوٚم بێزارم ، ده بیٚ
له مه وپاش چ خوٚشیه ک ببینم ؟ .

مه مه ند : (ده ستێک به ردێنه ماش و برنجه که یه وه ده

هێنێ ) دیسـان ده لێن شه کرو چا ده ست ناکه وێ .. خۆ منیش هێزو
گـوورێکی ئه وتۆم
نه ماوه تازه به تازه بێڵ کاری بکه م ، له لای خه ڵکیش به قایه کی
ئه وتۆم نه ماوه ، تازه دنیا له باروو داری خۆی نه ما ، مـه مه ند
ئێستا مه مه نده که ی جاران نییه ، مه مه ند شێته ، ده بێ هه موو
که له مێردیه کی جاران بخه مه ژێر پێیه وه و ، ده ست له هه رچی و
رچی گوند پان بکه مه وه ..
خاڵه هیمه ت : ئۆ هۆ ، دیسان به یته که ی بله یه ( بـه زه رده خه نـه وه ) گـوێ ی
مه ده رێ خودا به خۆی هه موو شتێ چاک ده کا .. (ده نگی قاسپه
قاسپی که و دێت ). رۆژگارێکی تووش و بێ فه ڕه ، تا ئه و رۆژه ی
ماڵئاوایی له دنیا ده که ی نازانی به چ ده ردێ سه رده بیێته وه ..
بنیاده م هه ر له ترس و دله کوتێ دایه .. به خوا بنیاده میش هیچه ..
له وانه یه مێشێک بیخاته گیانه لاَ .. که چی ته ماشا ده که ی که ساێک
هه ن وا ده زانن ئیتر دنیا نابڕێته وه ، به که یف و ماشای خۆیان
زوڵم و زۆر ده که ن ، به زه ییان به هاوخوێنه که ی خۆیان نایه ته وه ،
ئه وه- عه وله خێلی- له مه ڕ گوندی خۆمان، هێشتا له سه ر کرده وه ی
باوباپیرانی به رده وامه ، ده بینی گێنچه ڵ له و چاوڕه شه شێت و وێت و
هه شبه سه ره ده ئاڵێنێ .. !
مه مه ند :
هه ر باوباپیرانی ئه ویش بوون وه یسه یان به
گوشت دا .. زوڵم و
زۆر له خوێنه که یان دا ده ژی ..
خاڵه هیمه ت:
ئێ ی ، خوا هه قی بزنی کوڵ به سه ر بزنی
شاخداره وه نایه ڵێ.
مه مه ند :
خاڵه هیمه ت ، هه رچی به سه ر مرۆ بێت ئه
قـڵی خـوێ به سـه ری
دینێ . هه ندێ شت هه ن من قه ت باوه ڕم
پێیان نییه ، ناوچه وان،
چاره نووس و به خت ، ئه م قسانه بنیاده م
خۆی دروستی کردوون ..
خاڵه هیمه ت :
(به تووره ییه وه ) ماڵێکت لـه وه ته ی خـه زاڵ
بـه و ده رده چووه ،
تۆیش زۆر زه ندیق بووی (رووناکی له سه ر مه
مه ند و خاڵه هیمه ت
لاده چێ و به یت بێژ ده رده که وێ )

به یت بیژ :
یانیه ک ده چووتیه
که ی بیئ ئوقره یی
شت ، په نجه شت بئ
وه ..

له وه ته ی خه زالْ بیْ سه رو شوێنه ، گشت به
سه ر یه کێک له رووباره کان ، به ئاوه سازده
ده روونت فێنک ده کرده وه ، ده م و چاوت ده
به رده رگای چایخانه خه مباره که ت ده گه ڕایته

ئه ویش چه ند ساڵێکه به میچه داکه وتوو دیواره ته پیوه کانیه وه ،
هه ناسه ساردیتی پێنجاوه ته وه و، کردویه تیه نهێنه کی مه زن و بوته
داڵده تیش ..(وێستێنک ده کا) رووه و ریزه کێوه کان هه ڵده ترووشکای،
خوت گرموڵه ده کرد، ئه ژنوْ کانت ده کرده له نگه ری سه ره کاسه که ت،
فزه ت لێوه نه ده هات ،هه روه کو چاوه ڕوانی گویْ گرتنی سه مفوْتیه کی
( شوْپان ) بکه یت ، بوْ قاسپه قاسپی ره وه که وه ه ی ده مه ویه یان
گویْ رایه ڵ ده بووی ، . ئه م چاوه ڕوانیه ش خه مێکی تازه ی
ده کرده سه باری کڵوڵیت .. چونکه ئه و ره وه که وانه ش له وه ته ی
خه زالْ بیْ سه رو شوێنه ، سه ری خوْیان هه ڵگرتووه ، چیتر به قه ره ی
ئه م گونده هه شبه سه ره ی مه مه نده وه نه هاتوون .. هه ر چه ندت
ده کرد ئه م نهێنیه ترسناکه ت بوْ نه ده دوزرایه وه (بیْ ده نگی ) ..
ئه و سه رده مه هه ر له سه ره تای به هاره وه ، تا پایزێکی دره نگ
له کازێوه دا هه ردو کتان به ره م قاسپه یانه وه ده ستتان له گه رد نی
یه کتر شل ده بوو ، چوست و چالاک خوْتان ده پێچانه وه ، تا له به ر
تیشکی رۆژێکی نویْ ترا په ره به ته مه نی و ژیانی خوْش به ختیتان
بده ن .. (وێستێنک ) گه ڕبهاتبایه هه چ به یانی یه ک مارشی ده نگی
ئه و ره وه که وانه نه بووایه ، تا چێشته نگاوێکی دره نگک له خه و
ڕانه ده بوون . گشت کاروبارێکتان دوا ده که وت ، ئه گه رچیش ئه م
خه ڵکه گێژو وێژه ی گونده که تان قێزیان له که و ده بێته وه ، له
به رئه وه ی ده ڵێن باڵنده یه کی گزیرو خاینه و ، هوْزه که ی خوْی
ده خاته توْزی نێچیره وانه کانه وه .. به لاْم توْ ئه م به یت و باڵوْرانه ت
پشت گویْ خستبوو .. ئه مانه یش وه کو به یت و باڵوْره زوْره
پووچه ڵه کانی تر ، که به رماوه ی روْژگارێکی به سه رچوون ..
قاسپه یانت خوْش ده ویست ، به گشت ئاوازه سه مفوْتیه کانی دنیات

نه ده گوڕیه وه .. دونده که تان به ده نگی ئۆرکسترای ئه وان ئاوه دانه.
بوونه ته نیشانه ی کوڵنه ده رایه تی ئه م ده ورویه رو چیا سه ختانه..
زوزجاریش ده تووت : پاک نادرێته ده م پیسه وه ..
( به یت بێژ وون ده بیێ .. چاوره ش به هه ڵس وکه وتـی شێتانه وه
ده رده که وێ و ڕووناکی ده خرێته سه ر)

چاوڕه ش : (له مه مه ند نزیک ده بێته وه ) مه مه ند ، کاکه مـه مـه ند ، ئه رێ خه زاڵ هه ر نه هاته وه .. ئه ی که ی دێته وه .. ؟

مه مه ند : (چاوی پڕ ده بێ له فرمێک )له تۆ کڵۆڵتر خه زاڵه ..(مۆسیقایه کی به سۆز )

خاڵه هیمه ت: ( ڕووناکی ده خرێته سه ر) چاوره ش خان ، ئه م نه قامه تازه یه ت له چییه ؟ .

چاوره ش : ده ڵێ ی چی چی چی ؟

خاڵه هیمه ت : (له چاوره ش وورد دبێته وه ، له ته وقی سه ره وه تا په نجه ی پێ ی ته ماشای ده کات ) ده ڵێم ، ئه م نه قامه چییه ، که ئاوها له سـه ر یه ک تـه ل خۆت ڕازانـدۆته وه .. ده ڵێ ی بـه بـووکی ده چـی

( به زه رده خه نه وه )

چاوره ش : ( به ده وری خۆی دا ده سوورێته وه و ته ماشای جل و به رگه که ی به ر خۆی ده کات ) خاڵه هـیمه ت ، جوانـم ؟ جل و به رگه کـه م جوانه .. ؟ .

خاڵه هیمه ت : ( به زه رده خه نه وه ) په ح په ح ده ڵێ خه رامانی چینی ..

چاوره ش : ( تووڕه ده بێ ) نا کاڵته م پێ ده که ی تۆیش (به خۆیادانه وه ) نا ده مه وێ لاسایی ئاغاژن بکه مه وه ( خاڵـه هیمـه ت و مـه مـه نـد پێ ده که نن) ..

عه وله خێل : ( ڕووناکی ده خرێته سه ر ، هه ناسکه بڕکێنه تی ) سلاوتان لێ بێ ..
(که س وه رامی ناداته وه .. به تووڕه یبه وه ) چاوره ش ئـه وه تۆ

لێره ی .. ؟! دایکه کت و کوێره که ت به شوێنتا ده گه ڕێ باغ و سه رچه م و قوژبنی ئاوایی نه ما به شوێنتا نه گه ڕێ ...

چاوره ش : خاڵه هیمه ت به دوعا ، مه مه ند گیان ماڵئاوا ، خه فه ت مه خۆ خه زاڵ له رێگایه ( ته ماشایه کي عه وله خێل ده کات و تفێنک ده کاته زه وی ، به ده م چه پڵه وه ) عه وله خێل ، عه وله خێل ، ته وه زه ک و گێل ، عه وله خێل ته وه زه ک و گێل ..

عه وله خێل : ( تووره ده بێ و ، له به رخۆیه وه ) ده بێ ئه مه ت له بن پێ ده رێنم چاوه شێت ..(خاڵه هیمه ت و چاوره ش و عه وله خێل وون ده بن )

مه مه ند : ( رووناکی ده خرێته سه ر ، به ده م گۆرانیه وه ) :

ئاسکه کان گه رمیان به ر به ره لایه
وه یسه کوژراوه ده نگک برنه و نایه
له وساکه وه – چاوره ش – بۆ سه ر کانی و ئاو
ده نگی شه ده و له نجه و لاری نایه
به گۆڕی وه یسه سوێندی خواردوه
تاوه کو تێکرای نه وجه وانانی گوند
تۆڵه ی نه که نه وه له گشت شۆڕبا خۆرو ئاغایه
بۆ لاوێکی تر سۆمای چاوانی هه ڵنایه ..
ئای بۆ خوێم ، بۆ سوارچاکی مه یدان
بۆ سه رو مشکی له خوێن گه وزاو
بۆ لاشه ی بێ سه رو شوێن نێژروا .. (وون ده بێ )

به یت بێژ : (رووناکی ده خرێته سه ر) مه مه ند ئه نجاش ده تووت :

کۆرپه کانم ئه م ده وروبه ره هه ره ت و هه ڵدێره ، چه نده ها که له کێوی و به چکه شێری گلاندوه ..ئه م ده شت و دوڵ و نسارانه گه لێک وه یشوومه ی مێژووی تووش هاتووه .. به ته نێ کاره ساتی دڵته زێن و ناوی گه وره پیاوانی نیشتمانپه روه رو خۆفرۆش و خانیه کانی تۆمار کردوه .. به لام ئه وانه ی له دڵێ چه ندانی وه کو ئێمه دا

نووسروان ، میژوو وه کو ئافره ێکی بێ وه فا پشتی لێ کردوون ولچی
لێ هه لڤورتاندوون.. ( وون ده بێ ) ..

عه وله خێل : ( مرو مونچه ) به یانیت باش مه مه ند ...
چیـیه بیسـتوومه ده ڵێـن ده ته وێ چایخانه که ت موزکه یت .؟ ئه لجا چیت له
ژێر سه ر دایه ..؟. مه مه ند : ( به بێزاریه وه ) عـه ول گه رت لـه گـه ڕمـان
لاده . خوٚمان که م
ده ردمان نیبه (ده نگی ته ق و توقی پیاڵه حیای دیـت ) بـه ڕاستی
عه ول ئاغا تاقه تم چووه (به هه ناسه ساردیه وه ) .

عه وله خێل : ( به تـه وه سه وه ) نا .. نا .. دیـاره وه زعت
بـاش بـووه و ده تـه وێ بـڕوێ لـه شار بازرگانی بکه ی .. ؟ دیـاره
پاره یـه کی زوزیـشـت پینکه وه ناوه ..؟

مه مه ند : ئه ی هه مووتان به شێتم ناو نابه ن .. ؟ ئیـتر
شێـت چوٚن ده تـوانێ پاره پینکه وه نێ .. ؟ عه ول ئاغا لـه خوٚم
بێزارم و تاقـه تـی تـوٚم نیبه ، هه شی توٚشمان به سه ر.. (رووناکی ده
خرێته سه ر سێ چوار مندالْ ، ته ما شای عه وله خێل ده که ن و ده ده
نه قاقای پێکه نین )

مناڵه کان : مه مه ند ده مانه وێ به ده نگه خوٚشه کـه ت بـه
سه رهاتی وه یسه و چاوڕه شمان بوٚ بگێڕیته وه ..

منالی (١) : مه مه ند ، راسته ده ڵێن چاوڕه ش له سوٚیێ وه یسه شێت بووه ..
منالی (٢) : ده ی تو خوا مه مه ند بوٚمان بچرکێنه ..
منالی (٣) : مه مه ند بیستوومانه دیسان ده ته وێ سه ری خوٚت هه لگری .. ؟
مه مه ند : ( گه رووی پڕ ده بێ له گریان ) چی بکه م ئوٚقره م لێ براوه ..
منالی (١) :( به گزیه وه ) ئه ی ئیتر کێ به گورانی داستانی ئه وینی وه یسه و
چاوڕه شتمان بوٚ بگێڕیته وه ؟
منالی (٢) : ئیـتر کێ ده بێته مایه ی شانازیی گونده که مان ..
مه مه ند : (ده ست ده خاته په نا گوێ ی و گوٚرانیه که ده لێ )

ئه سپی سواره ی حه میدی دووای براببوٚوه
پاشان پوٚستالْ و به رگه ره کی ئینگیره کان
به شوێنیا له م ده ووبه ره گیر سابوٚوه

که وتنه مله قوتیْ ئاغاو شۆرباخۆره کان
ده ست له سه ر نێزه بوون بۆ شارو گوندان
چه ندان پیاوچاک و به خام سه رگه ردان کران
چه ندان گوندیی ره ش و رووت دۆ مردن له برسان ..
به لاْم وه یسه ی تێکسمراوی کوره جووتیاری هه ژار
برژاوی ، هه لُقرچاوی به ر گزه ی گه رمیان
ئه گه رچی چاوره شی ئاموزای ئه وینداری بوو
کاتیْ خه میش ده بێته وولاْتی له دلْ ئاشقان
جوانی شۆخترین ئامزه ت تام و بۆی نامێنیْ
ده بێته هه ناسه ساردی و تروسکه ی بێزاریی
بۆیه وه یسه که وته کێوان .. ( وون ده بیْ ) .
به یت بێژ : بووه هاوده م و هاوسه ری ئاسکه و وه حشیان
تاوه کو پسهُ یته وه کوڵه ی گوندیان
له بری ئاسکه و کـ لُه کێوی و سووچه رو به راز
ده یکرد روای ئاغاو شۆرباخۆره کان
ئه می خواری کردن ، کردیانیه کوونه وه ..
به لاْم به یانیه ک بوو له شکری نووری پاشا
ئابلووقه یْ گوندی دا
بووه ناڵه ی مه تره لۆزو قیژو هه را
به لاْم ده سته ونیشانی سه عه ی سه گی سه را
گولی که له مێردی و جوانی وه یسه ی پێکا .. (وون ده بیْ)
خاڵه هیمه ت : ( رووناکی ده خرێته سه ر) جێگاو رێگا ویان ئه ما له ژێر
ناڵی ئه سپی شۆرباخۆره کانیان ئه ناڵێنیْ
گازی پشتی گوندیه کانی ئه م ده ورویه ره
بووه شوێن داغمه ی لیس و نێزه یان
کیژو ئافره ت ئه ما ده یانجار به رگی ره ش
ئه پۆشی ، ئافره تی پاکیزه ئه ما سینحی ده م و لچی ئه م
گێنچه لاْویانه جوانی ی ئه رووشێنیْ .
مه رو مالاْت ئه ما ژه هرالووی ئه که ن ،

پیاوچاکان ده ربه ده رکران ، منالیان له به ر دایکان هه ڵده گرت و تووریان ده دایه به ر
سه گه پۆلیسیه کانیان(وێستێک ده کات)خانوبه ره نه ما وێرانی نه که ن

مه مه ند : (رووناکی ده خرێته سه ر) به لام هه ر زاڵمێک
زه والێکی هه یه .. وه پسه کوره جووتیاری تێکسمراو ، هه ڵقرچاوی
به گره ی گه رمیان ، سوار چاک و هه ڵۆی کێوان ، ئه گه رچی
چاوره شی ئامۆزای ده زگیرانی بوو ..
خاڵه هیمه ت : به لام هه رکه خه م له دڵی ئاشقان ده بێته
وولاتێ ، جوانی و بوتی ئافره ت تامی نامێنێ جوانترین ئافره ت ده بێته
تروسکه ی بێزاریی . بوێه وه پسه که وته کێوان ، تا توڵه ی هه شبه
سه ران بکاته وه له ئاغاو شوڕباخۆره کان . ساڵه های ساڵ بووه
هاوده می که له کێوی و وه حشیانی ده شت و کێوان ، قه مته ری کرده
لغاوه یان .. خه ڵکی ئه م ده ور وبه ره ئاهیان وه به ر هاته وه ، ئۆخژنی سه
رخرازیان هه ڵکێشا ( به خه مباریه وه )هه موو شه وێ وێسه بۆ گوند
ده هات و تا به یانی له گه ڵ چاوره ش ده مایه وه ..
مه مه ند : (به تووڕه ییه وه ) به لام ئاغاو شوڕباخۆره کانیان ،
به م سه ردان کردنه شه وانه ی وه پسه یان زانی بوو .
خاڵه هیمه ت : ئاغاو شوڕباخۆره کانیش بۆ هه ل ده گه ڕان ،
تا له ناوی به رن ، بوێه له مه ڕ میری به ناوی چه ته یی و دزی
به د ناویان کردو قوویان کرد به شاران دا ..
مه مه ند : (به سه ر سووڕمانه وه ) تا .. تا ..هه ر خوێنانیش له
شار ماڵی به گێنک له گه وره پیاوانی ئینگلیز ده برن ، ناوی مێجه ڕ
لاین بوو ،ده یخه نه ئه ستۆی ئۆ باڵی وه پسه (مه مه ندو خاڵه
هیمه ت وون ده بن ،
به یت بێژ ده رده که وێ)
به یت بێژ : ئه وه بوو به یانیه کیان خه ڵکی ئه و
گونده هه شبه سه ره . شه که تی خه و بوو . وه پسه و چاوره شیش له
و ده مه دا پێکی
ئه وینداریان ده نوش .. له شکری نووری پاشا گه ماروّی گوندی دا ..
دیده کێنی چاوره ش تروسکاییان کوژایه وه ، به مه رگی نه شقێنک

پلیان ده دا . . بوو به ناله ی شه ستیر و مه تره لوژ . گوند بوتی
خوێنی لیٚ ده هات . لاشه ی خوێناوی وه یسه به کیٚش کرا . هه موو
خه ڵکه خولی مردوویان به سه را کرا . . ئه وه ی لاشه ی وه یسه ی
راکیٚشا ، ده لیٚن لایه کی بوته به راز له م سالاٚنه ی دواییه دا . .
سه رله نویٚ ئاغاو شوٚرباخوٚره کان له کوون هاتنه ده ریٚ ، که وتنه
خوٚیان و ئه م ده ورویه ره یان دیسانه وه ته نی و که وتنه ویٚزه ی
ره ش و رووتان .. ( تاریکی ) ..

چاووره ش : ( رووناکی ده خریٚته سه ر وه کو بلٚیٚ ی له ناو زوورینک دایه
به ده وری خوٚی دا ده خولیٚته وه ، له گه لٚ خوٚی به هه لٚس وکه وتی
شیٚتانه وه یاری ده کات )

به یت بیٚژ : ( رووناکی ده خریٚته سه ر ، چرایه کی به ده سته وه یه واتای ئه وه
ده گه یه نیٚ کاتی شه وه ) چاوره ش پتر ئیٚواران سه ری خوٚت
هه لٚده گری . هه رکه ده گه یته ده ره وه ی ئاوایی به دلٚشکاویه وه
هه لٚده روانیته بالٚه خانه و خانووه سه رکزه کان . بریار هه نیسکت
ده شاریٚته وه . گوزه رکردن به گوندا بوٚت مه حالٚ ده بیٚ . ناته ویٚ
جاریٚکی تر که س چاوی پیٚت بکه ویٚته وه ، بگره سه ری خوٚت
هه لٚگری . . ( موٚسیقا ) . . به لاٚم هه نگاوی پیٚیه کانت
به پیٚچه وانه ی ده روونت به ره و کولاٚنه کلٚوٚلٚه کانی گوند ، په کلیٚشت
ده که ن و خلٚ ده بیته وه . . سه رله نویٚ کلٚوٚلٚی و کوێره وه ری گوند
ده که تیه کوٚریه یه ک و له ئامیٚزی ده گری . ئه وه ی لیٚت ده پرسیٚ
وه یسه له کویٚ یه ؟ ( چاوره ش له سه ر زه ویه کی روٚده نیشیٚ و
ده که ویٚته خه ت کیٚشان ) ، به خه مباری پشتاو پشته وه
ده چه مایته وه ، به بیٚ ده نگیه کی کوشنده وه ، ویٚنه ی تفه نگیٚک و
که لٚه ئاسکیٚک له سه ر رووی خوٚلٚه په تانیه کی ده کیٚشی (موٚسیقا)
چاوره ش چاودیٚری ئه ستیٚره خه والٚوه کان ده کا ی .. هه رکه
ئه ستیٚره یه ک ده کشیٚ ، کسپه یه ک ده روونت ده کیٚلٚیٚ ، گوموٚلٚه
ده بی ( چاوره ش ده که ویٚته مزه مزی گورانیه کی خه مباره وه ،
چاوی پڕ ده بیٚ له فرمیٚسک) چونکه هه ست ده که ی ئه ستیٚره ی
مروٚڤیٚکی کلٚوٚلٚ و بیٚ نه وا ئاوا ده بیٚ ، بوٚ دواجار ئه م جیهانه ی

به جێهێشت و سه ده ها وه دی نه هاتووی به ئاکام نه گه شت .تۆ هه ر
چاوه ڕوانی وه یسه ده که ی ، مه مه ندیش چاوه ڕوانه خه زاڵ بێته وه .
ته مه نی هه ردووکتان هه ر چاوه ڕوانیه .. ( مۆسیقا ، تاریکی ) عه
وله خێل : ( رووناکی ده خرێته سه ر ، وه کو بیلێ ی ده یه وێ پیلاتێک
بگیرێ ، چاوده گێرێ که سێکی به رچاو بکه وێ . . له به رخۆیه وه )
چاوه ش هه ر ده بێ ئه م شه و ناوت بزرێنم ، به یه نسدی گوندت
بکه م ، تۆی شرو شێتیش رقت لێم ده بێته وه ، به شێتیت
ڕازی بووم ، له هه رکوێ ده مبینی تفم لێ ده که ی .. ئێ خۆ من
هه ر له منالێیه وه حه زم بوو ، که چی که وتیته شوێن ئه و وه یسه
چه ته و پیاوکوژه ، دلی خوت پێ ی دا . ئه گه ر ئه و کوڕه
جووتیارێکی رووت و ڕه جاڵ بوو ، خۆ من به رچه له ک گوڕه ئاغا
بووم . . ئه م جووتیارانه ده لێ ی هه ر له منالێیه وه دوورسی
شه یتانیان خوێندوه ( ویستێنک ده کات ، وه کو بلێ ی که سێک
به ته نیشتیه وه تێپه ڕ بوو ، لێ ی موژده بێته وه هه ر ئێستاکه
به قوربانت ده بم ( به ده نگی به رز ) هۆ خه لکینه ، هۆ ئه وانه ی
به ته نگی شه ره فی گونده وه ن ، ئه وه ی له م گونده قه وماوه ،
له چ گوندێکی تر نه قه وماوه .. هۆ خه لکینه ، خه ریکه مالتان
نوغرۆ ده بێ ، ئابرووی هه موو ئافره تانتان ده تکێ ، ده مێکه
نهێنیه کم شاردۆته وه ته نها بۆ گل نه بێ بۆ که سم نه درکانده
( ته ماشایه کی ده وروبه ری خۆی ده کات ) بۆ دوو مانگک ده چێ
چاوه ش که س نازانێ کچێنی خۆی له ژێر چ دره ختێک دوڕاندوه ،
باش شه ش حه وت مانگی تر ده بێته دایکی مه لوتکه یه کی بێ باوک..
هۆ خه لکینه من ئه مه بۆ خوا ده لێم ( ویستێنک ده کات ) تا
زووه ئه م بێ ئابروییه له رووخساری گوند بسرنه وه . . چاوه ش
دێ به ده رکه ن ، یان ئه وه تا خه مێکی بخۆن ( هه س ده گرێ ،
له به رخۆیه وه ) ده لێ وه کو بزانن درۆ ده که م ( به ترسه وه )
برۆم چاکه ، با که سێک چاوی پێم نه که وێ ( ده نگی ته ق و
توقی به رده باران کردن دێت . . هه ردوو ده ستی ده کاته چه تری

سه ری و هه لدیّ ) ..

خالّه هیمه ت :( رووناکی ده خرێته سه ر ، خوّی باده دا ) هه موو ئه نامی جه سته م
ده یه شیّ . زوّر دلّم سه غلّه ت بوو ، وتم بابچم به لای
مه مه نده وه ، ئه گینا وه ها نه بووایه له تویّ جێگا ده که وتم . مه

مه ند : ( رووناکی ده خرێته سه ر . . ده نگی پیالّه
چای دیت ) خوّ زستانیش نییه بلّێین سه رمات بووه خالّه هیمه ت
کولّچین یش ده مێکه مالّئاوایی له دنیا کردووه . . ئه گینا ( به زه رده
خه نه وه ) ده مانووت کاری مه له کردنی به یانیانه . .

خالّه هیمه ت : ( به ته و سه وی ) له توّ به ده به خت تر منم ، ئه وه ی راستی
بیّ مه مه ند ، مانگێک بوو زوّر چلّکن بووم ، توّ قره م لیّ برابوو ،
وتم ده سا با بچم له ئاوی چه مه که هه ندیّ خوّم هه لّشه پێنم ..
دوێنیّ ده مه و عه سرێک ئاوێکم به خوّم دا کرد ( خوّی باده دا )
کزه بایه کی ساردی ده هات ( وێستێک ده کات ) خوّزگه مردن
هه بووایه به لاّم ئه م پیریه سه گباب خێوه نه بووایه ( به خه مباریه وه)
به خودای مه مه ند ئه وه ی پاش مردنم لیّ ی بترسم ، تویّ ...
داخوّ کلّولّ بارو وه زعت چوّن ده گه ریّ .. چـاوه ره شیش چی لیّ
به سه ر دیّ ..

مه مه ند : ئه وه نده ولّم به دنیا خوّش نییه تاوه کو لێم
بترسی . . له وه ته ی خه زالّ بیّ سه رو شوێنه ده مه ویّ خوّم تووشی
گاشه یه ک بکه م و له کولّی دنیا ببمه وه ( به هه ناسه ساردیه وه )
گونـاح بار ده بم ، ئه گینا خوّم له کێوه به رزه وه تووڕ ده دا . .

خالّی هیمه ت :( به زه رده خه نه یه کی خه مباریه وه ) چییه ده لیّ ی ئاخرو ئوخری
دنیانه . . بوّ ئه وه نه ووره ت رووخاوه ؟ ( سه رداده نه وێنیّ )
راستیش ده کـه ی ، که س وه کو من و تـوّی لیّ نه قه ومیّ .. مه

مه ند : خوّزگه م به خوّت ، هه ر هیچ نه بیّ کولّچین
له پێش چاوی خوّت مردو خوّشت کفن و دفنت کرد .. ئه ی من
چی بلّێـم ، ئێستـاش نازانم چی لیّ به سه رهات . دێو بردی ؟ درنج
خواردی ؟ سه رنگوونیان کرد ؟ ( وێستێک ده کات ) هه ر ئه وه یه

کی لە گوند خەلکی دە یگێڕنە وە . .

خاڵی هیمە ت : ( بە نیمچە تووڕە یە کە وە ) تـوێش لە و ساکـە وە هـە لـس وکە وتت لە گە ڵ خە لکە گوند گۆڕاوە . . زۆر جاریش دە چیتە گژی دنیاوە . . ماڵێکت هە قیانە بلێین مە مە ند شێت بووە . .

مە مە ند : ( سە رێک بادە دات ) پیاو لە ناوە ڕاستی ئە مە ن ، یان لە زۆر ئاقڵی دا شێت دە بێ ، یان لە تە نیانی . من ئە وە ی یە کە میان نیم . . ئە وە ندە ش بە جورئە ت نیم تا دە ستم پچێتە خۆم ، یان وادیارە هێشتا دڵم بە دنیا خۆشە . . پیاویش سە ری خۆی هە ڵگرێ جۆرە خۆکوشتنێکە بۆیە وە ها بڕیارم داوە .

خاڵە هیمە ت :هە موو جارێ کە سە ری خۆت هە ڵدە گری ، تا دێیتە وە مندالی ووردکە ی گوند خە وو خۆراکیان لێ هە لـدە گیرێ ، ئیـقـانیـان لە یستە یانە وە دە ردە ە رێ . هە موو رۆ ژێ هە ر لە بە یانیە وە تـا درە نگە وە ختێک ، لە سە رە ڕێگاکان دا هە لدە تروشکێن و چاوە ڕێی هاتنە وە ی تۆو خە زاڵ دە کە ن .. ئە م گوندە بە ئێوە وە ئاوە دانە ، کە سێکی تر تێدا هە لنا کات . چونکە ئێسـک و پرووسکی باوباپیرتان بوّتە پە ینی ئە م خاک و خوڵە ..

( تاریکی )

( ڕووناکی دە خرێتە سە ر ) مە مە ند ، بە یت بێتر : پوشی ی زە ویە . واڵدە ی حە سانە وە ی بڕینە بوێن و بـە رامـە ی تـە میژووی سە ر سە ختی ڕابووردو ئـوقـرە ی کوێن و نوێکا نتە . میردیی و سە ربە ستی و خۆراگرتنی مرۆڤایە تیتە . دواروژتە . مایـە ی کە لە فرمێسک و هە ناسە دان و ئاسوودە ییتە .. نە ئە زام و زە ردە خە نە و نە توێش بێ ئە و ونت هە یە . لە میژدایە بێ و بێ تۆ دە ژیت و بە لام هە ریە ک بە دووای یە کترە وە وێلن . سە رو سوراخ ماوە .. یە کترتان نییە . دە بێ چاکی لێ بکە ی بە لادا هێشتا توانای دوزینە وە ی ئکلیلی ووڕە بـە ڕنـە دان ، هـە نـگاوە کانـت . وە ڕزییت بکە یتە تێ کۆشان ، تاوە کو دیسـانە وە وە کو جاخی بکە یتـە شوڕە سواری دە سرە وون .. لە سووچێکی شانۆوە ڕووناکی سە ر جاران لە ئامێزی یە کترا جۆرە بـزووتـنێـک دە کـا ، وە کو بـیـسە وێ تارمایی ئافرە تێک،

حوی لـه ده ستـی په له ماردانیـک رزگـاریکات ، به بـزووتنی
پانتومایم تـه عبیر لـه حاله ته که ی ده کات )
به یت بیژ : مه مه ند ، ئه و روژه ی به سه ر گونده که ت دا
درا ، له سینه ری زوره گویزه که دا ، هه لاژابووی ، به لای پاله وه
چاوه خاموشـه کانت بریبووه تووله رینگاکه ی به رامبه ر . . ئه مه
پیشه ی روژانه ت بوو. هه رکه خه زال وه ده رده که وت ، ماندووییت وه
کو گاکوترینک ده یدایه شه قه ی بال و هه لده فری ، توش له گه ل
ماندوو بوون دا ده تـدایه شه قه ی بال ، چه سته ت ده بووه سوزنیکی خواها
نه و به ره و گه والی هه وره نه زوکه کانی هاوین به رز ده بـووه . .
( هـه ناسه یـه ک هه لده کیشی ) تا له زه رده گه رمای ئـه و
ینـوه رویـه دا نالـه ی شه ستیرو حوسکه پـه لـه وه ره کانی هه راسان
کرد .. خه لکه که ش وه کو په له وه ره کان سه ریان لی تیکچوو ،
بـه هـه له داوان خویان ده کردن بیشه و ژیر تاشه به رده کانه وه .. له
شورنی خوت دا بوویته یه کینک له دار گویزه کان و ره پ راوه ستای (
ونستینک ) دلت لـه چه په ری سنگت ببوه چوله که یه کی سه ریراو نه
قه فرته ی ده کرد... ده مه و ئیواره باسی بی سه روشونی خه زال به
گوند و گونده کانی ترا بلاوبوه وه .. هه ندی که س ده یانووت خوی که
وتـه تـه ک ئـه واندی دایان به سه ر گونده که دا ، هه ندیکی تریش ده
یانووت پاشی ئه وه ی نه تکیان کردو ئـابروویان تکـان ، بـریاری دا سـه
ری خوی هـه لگری ناگه رینته وه تا تولّه ی نه که نه وه ،

(تاریکی )

(رووناکی ده خرینته سه ر دوو سی که س ، راوه ستاون )

که سی ۱ : مه مه ند هه میسان چانچانه که ی داخست .

که سی ۲ : ئه م به یانی یه خه لکی دیویانه له ئاوایی ده رچوو ، له تروپکی کیوه به رزه ئاوه دیو بووه ..

که سی ۳: کلول دووای کلاوی بابردوو که وتی .. ئه وه ی بری چون دیته وه !!

که سی ۱ : له وه تـه ی رووبـان کردوتـه ئـه م گونـده خیرو خوشیان له خویان نه دیوه ..

که سی ۳ : به خوای خه زالْ ئاخره تیکی شۆخ و به شه ره ف
و یه که ژن بوو ..
که سی ۲ : دیاره مه مه ندیش ده یه وێ له رێگاویان سه
رینێته وه .. ؟!
که سی ۱ : ئـه م جاره ئـه گه ر خوای کرد هاتـه وه ، ده
بیه ستیـنه وه ، چیـتر نایه لْین له گوند ده رچێته ده ره وه .. باوکم ئه م
کابرایه ئاگره سووره ی خۆیه تی .. ده تر سێن به لاْیه کی به سه رینێت ..
که سی ۳ : بۆ ده توانین قسه ی له گه لْ بکه ین .. ئه و هه
موو ئیمه به شێت و نه فام تیْ ده گا ..

( خالْه هیمه ت په یاده بیْ )

خالْه هیمه ت : (به کزیه وه ) ها .. دیسان چی قه وماوه ؟ وه ها
سه رتـان بـه یـه کا کردوه ؟ ..
که سی ۱ : به خوا خالْه هیمه ت مه گه ر ئه و ئه سپه سه
رکێشه ته نها به کۆ دابێن بکرێ .. ئه گینا کی یْ تر ؟ .
خالْه هیمه ت : ( به سه رسوورمانه وه ) کام ئه سپ ؟
که سی ۲ : مه مه ند ..
که سی ۳ : دیسان سه ری خۆی هه لْگرت . ئه م بـه یانی یه
دیـوریانه لـه کـه لی کێوه به رزه ئاوه دیو بوو ..!
خالْه هیمه ت : هه قیه تی .. ئه و ئاگره ی له ده روونی ئه ودایه ،
کێوی قاف ده رقه تی نایه ت. هه رکه سێ له ئیمه بێت له و خراتری
به سه ردێ ..
چاوره ش : ( به هه لْس وکه وتی شێتانه ی خۆیه وه په یاده
بێ ) خالْه هیمه ت ، ئه وا بۆ هه موو مات و گرژو مۆنن ؟ بۆ که س
له ئاوایی مردوه ؟.
خالْه هیمه ت : ( به نیمچن تووره که وه ) نه خێر ، چاوره ش هیچ
رووی نه داوه ..
چاوره ش : ( به سه رپادانه وه ) دیاره چاوه روانی هاتنه وه ی
وه یسه ده که ن .. ئا .. ئا .. چونـکه ئه م شه و لـه خه ون دا
پێیان وتـم ، چاوره ش ئاگادار به سبه ینێ وه یسه دێته وه و چاوره وانی

به . خۆت له سه ر یه ک ته ل بڕازێنه وه و به ماچ و مۆچی گه
رم و گـوڕ پێشـوازی . بکه ( تـه ماشایـه کـی خـۆیده کات ) ئـه وه تـا
ده بینـن ؟ منیش بـۆ چاوه وه رانی ئه و هاتتوم .. ( مۆسیقا ، ئه بن
تاریکی ) ..

(رووناکی ده خرێته سه ر چاوره ش ، له سووچێکی شانۆ هه لکورماوه،
هه ندێ جار مژه مژی گوڕانی دێنێت . عه وله خێل به دزه دزه له
چاوڕه ش نزیک ده بێته وه . خه نجه ڕێکی به ده سته وه یه ، یه کسه ر
په له ماری چاوره ش ده دات و به ر خه نجه ری ده دات ) ..

کۆرس : ( هـه موو ئه کته ره کان ده بنه کۆرس ، به ده م گۆرانیه وه ) :

چاوڕه ش کچێنیت بووه تارایه کی سوور
بووه سه رۆشی لاشه ی ته وه زه له کان
خه ڵتانی خوێنیان کردی له سه ره ڕێگاکان
عه وله خێل وه کو باوباپیرانی
تینووی خوێنه و ئابڕوتکان
پاره پاره ی کردی له سه ره ڕێگاکان
هه ر پارچه یه کێ بووه چاوڕه ش له دووڕیانه کان
داته شه قه ی باڵ وه کو فریشته ی خویناوی
ئێستاش هه موو شه وێ ئێشکی گوند ده گری

منداڵه کان : ( خاڵه هیمه ت پێشیان ده که وێ و به ده وری کۆرس دا ده سووڕێنه وه)

مه مه ندیش له ڕێ ی خه زاڵ
بوه نیمچیری نیمچیره وان
له خاڵه هیمه ت ماڵئاوایی یه کجاری کرد
بووه خۆراکی درنده و وه حشیان ..
چاوڕه ش و خه زاڵ هه ردوو جووته خوشکن
بۆ وه یسه و مه مه ندی جووته برا
کوزیی چاوه ڕوانیان ده هۆنیه وه
تۆڵه ی ئه وانیش هه ر ده کرێته وه
کاتێ ئێمه ش گه وره بووین
شوێن پێیان هه ڵده گرین
ڕۆژگار ده که ینه شه قشه قه ی ده ستی ساواکان
(تاریکی )

* * *

که رکووک / ١٩٨٥